کتێبی گیرفانی کاروان

زنجیرە
2

# تیشکێک لەسەر زمانی دانیشتووانی کۆنی کوردستان

.زمێکنی خووری و ئوورارتوو

د. کوردستان موکریانی

# تیشکێک

# لە سەر زمانی

# دانیشتوانی کۆنی کوردستان

# (زمانانی خووری و ئورارتوو)

د. کوردستان موکریانی

پیتچنین: نوسینگەی رواندز بۆ کۆمپیوتەری ماکینتۆش
باڵەخانەی: عثمان مهندس- نهۆمی سێیەم

# پـــێـــشـــەکـــی

نەبوونی هیچ بەرهەمـێکی سـەربەخـۆ بە زمـانی کـوردی، کـە زانیاریەک لە سەر زمانانی خووری و ئورارتودا بگرێتە خۆی، هۆی سەرەکی ئامادەکردنی ئەم بابەتەی بەردەستە.

رۆشنبـیـری ئەمـڕۆی کـورد هەرگـیـز پێناسـەی خـۆی بـۆ سـاخ نابێتەوە، ئەگەر رابوردووی خۆی لا روونـاک و ئاشکرا نەبێت، کە خووریان و ئورارتویان لایەنێکی گرنگیان لەم رابوردووەی ئەو بە کـەلـچـەرێکی دەولـەمـەند لە خـاکی کـوردسـتـان دا پڕ کـردۆتەوەو هێندێک جار لە چەند بوارێک دا تا رادەیەک کاریگەری لە سەر گەلانی دراوسێشی دا هەبووە.

هەر ئەم کـاریگەری کـردنە بوو بـە هۆی ئەوەی ئەرمـەنی نـاسـان و کەفکاز ناسان بە دەیان ساڵ پێش ئێستە هەوڵ بدەن بەندیوارێک لە نێوان زمانی ئەرمەنی و زمانانی کەفکازی دا لەگەڵ زمانانی خووری و ئورارتودا پەیدا بکەن، ئەمە لە کاتێک دا، کە خووریان لە نـێـو جـەرگـەی کـوردسـتـان دا ژیاون، نەک لە کـەفـکاز و ئەرمـەنسـتـان، بەڵـکو دەسـەلات دارێتـیـیـان هێندێک لە ناوچەی ئەوانی گرتبۆوە.

خـوورێکان بە نێـوبانگـتـرین گـروپی زمـانەوانی و کـولتـووری سەربەخۆی ولاتی کوردەواری بوون، کە لەگەڵ داهاتنی نووسین دا نێویان هاتووە، چونکە رۆڵێکی سـەرەکیان لە مـێژووی باکووری مـیـسـۆپۆتامـیـادا گـێـڕاوە، بە تایبەت لەلایەن رامـیـارێوە بە پەیدا بوونی پاشـــایەتی ئورکـــیـش (٢٢٣٠-٢١١٦ پ.ز) وە یا

پاشـــایەتی ئورکـــیش و نەوار (٢١١١-٢٠٠٣ پ.ز)و هەروا دەوریان لە لایەن شارستانێتیێوە هەبووە، ئەویش لە بواری ئایین و یاسـا و کـاریگەری زمـانەوە، جگە لەمـەش خووریـیـان دەورێکی دیاریکراویان هەبووە لە گـواسـتنەوەی زۆر لایەنی کـولتـووری میـسۆپۆتامیا بۆ ئاسیای بچووک و ژووورووی سوریا و لوبنان بە تایبەت لە چەرخی بووژانەوەی پاشایەتی حیثی دا.

ئورارتوەکـان لە نیـوەی یەکـەمی هەزارەی یەکی پ.ز.دا بە هێـزێکی رامیـاری زۆر بە هێـز لە باکـووری مـیـسـۆپۆتامـیـادا دەژمێـردران و خـوداوەندی مـەزنیـان (خـاڵدی) لە مـوسـاسـیـر لە نێـزیک رەواندز بووە، دەسـەڵات داریتـیـشـیـان گـەیشـتـبـووە لای کێوەکانی کاف.

لەبەر پێوەندی جوگرافی وڵاتی خووری لەگەڵ وڵاتی کوردەواری دا لە مێژووی کۆن دا پێویست دەکات، کە لایەک بە لای زمانی ئەو مـرۆڤـە کـوردسـتـانیـیـەدا بکەینەوە، کـە لەو سـەردەمـەدا لە کـوردسـتـان دا ژیاون و هێندێک لە خـووری لۆژان بە بەڵـگەی نابابەتانە رەگەزەکەیان بۆ رەگەزی جۆراو جۆر دەگەڕێننەوە.

کورد دەبێت ئەگەر هەر نەبێت لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی لە سەر زمـانی خووری و ئورارتوودا بە زمـانی کوردی هەبێت، کە زمانێکی کوردستانی بووەو گەلەکەشی هاوچەرخی سومەر و ئەکەد بووەو لە ڕووی کەلچەرەوەش هیچی لەوان کەمتر نەبووە.

لە پاڵ ئەمانەشداو لە پێناو لێکۆڵینەوەیەکی زانستانەو بابەتانە لە مـێـژووی پەرەسـەندنی زمـانی کـوردیدا وام بە باش زانی لە کـۆنترین زمـانێکی نووسراوی کوردسـتـانی دەست پێ بکەم، کە

ئەویش زمانی خووری یە، چونکە کاریگەرێتی زمانی خووری کە لە دواتردا پێی وتراوە ئورارتوو بۆ سەر زمانی کوردی تایبەتێتێکی سەربەخۆی پەرەسەندنی زمانی کوردی لە نێوان کۆمەڵە زمانانی ئێرانیدا پێشان دەدات، لێکۆڵینەوە لەم دوو زمانە بۆ زمانی کوردی کارێکی زۆر پێویستە، چونکە ئەم دوو زمانەی کۆنەی کوردستان دەبێت بەندیوارێکی بەتینی زمانەوانیان لەگەڵ زمانی میتانیدا هەبووبێت و ئەوەی شایەنی باسە زمانی میتانی بە زمانێکی پرۆتۆ کوردی دادەندرێت.

هەیرن فەین
١٩٩٥/٤/١٤

# شوێن و کاتی هەبوونی
# خووریيان و ئورارتوویان

به پێی ئەو بەڵگانەی، کە هەن، ئەوە روون بۆتەوە، کەوا شوێنی نیشتەجێ بوونی بنجی خووریيان هەرێمی ژووررووی میسۆپۆتامیا بووه، کـه نێـوان کـێـوەکـانی زاگـرۆس لە بەری رۆژهەڵات و کەرکـەمـیش، کـە لە سەرووی شـاری حەلەبە لە بەری رۆژاوای. کاتی پەیدابوونییشیان لە مێژوودا بۆ نێوەڕاستی هەزارەی سێی پێش زایین دەگەڕێتەوە.

خووریيان نزیکەی هەزار ساڵێک دەسەڵات دارێتیان لە وڵاتی کوردەواری ئەمڕۆو تا ڕادەیەکیش هەرێمانی دەوروبەریدا هەبووه، کـیـکلیب ئەتەل، کـە پاشـای ئورکـیش بووه لە دەوروبەری ۲۲۳-۲۱۱٦ پ.ز.دا ژیاوەو دوا پاشاشیان ئەتیش خوربی لە دەوروبەری ۱٦۲۵-۱۵۹٤ی پ.ز.دا نێوی هاتووه (د. جەمال رشید أحمد و د. فوزی رشید- ۱۹۹۰).

بەڵگەش بۆ ئەمە، کە کوردستانی ئەمڕۆ مەڵبەندی خووریيان بووه، ئەو شوێنانەن، کـە لە نێو شـوێنەواری نووسراودا هاتوون و فەرمان ڕەوایەتییان تێدا کردووەو ئەمڕۆش هەر کورد نشینن، هەروەکو لەم باسانەی ژێرەوەدا ڕوون دەبێتەوە:-

پاشای خووری (ئەتەل شین-دەوروبەری ۲۱۱۱-۲۰۰۳ پ.ز) تابلۆیەکی، کە لە برونز دروست کراوه جێ هێشتوو تێیدا دەڵێت: (من ئەتەل شین کوڕی شتوماتم پاشای ئورکیش و نەوار..) ئورکیش، کە مەڵبەندی خوداوەندی خووری کوماربی بووه،

کەوتبووە سەر سەروچاوەی ڕووباری خابوور و نەواریش لە بەری ڕۆژهەڵاتی دجلە لە نێوان زێی خواروو ڕووباری دیالەدا بووە.

خێزانێکی خووری، کە بە ولوو نێوداره، ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی لە کەرکوک بۆ بە جێ هێشتووین، کە پلەی شارستانێتی ئەراپخا دەنوێنێت.

لە سەرەتای هەزارەی یەکی پێش زایین دا خووری زمان ئەم دەوڵەتە بچووکانەیان پێکهێناوە، کە هەموویان کەوتبوونە کوردستانی ئەمڕۆ:

١- گوزانە (تل حلف ی ئەمڕۆ، کە کەوتۆتە هەرێمی سێ کوچکەی نێوان عێراق، ئێران و تورکیا).

٢- خوبوشکیا، دەوڵەتێک بووە ڕووبەڕووی ئاشووریيان، چونکە کەوتبووە نێوان ئاشوور و ئورارتو لە سەر دۆڵی ڕووباری بوهتان (بۆتان) سوو.

٣- شوبری وە یا شوپری لە بەرزایەکانی ساسۆن دا.

٤- دەوڵەتی دەیاوخی لە دۆڵی ڕووباری چوروخ و لەوانەیە لە قەرە سوو و سەرووی ڕووباری فورات دا بووبن.

٥- دەوڵەتیماننا، لە باشووری گۆمی وورمێ.

خووریيان دەسەڵاتدارێتییان بەسەر هەرێمانی دەوروبەریشیان دا هەبووە، بۆ وێنە گەیشتوونەتە فەلەستین هەلبەت لە پێش جوولەکە، هەروەکو تەورات خۆی دانی پێدا هێناوەو بە حووری نێویانی لە سفر التكوين دا بردووە.

خووریيان لە سەردەمی پاشایەتی نوێی حیثیان دا (XIII-XIV پ.ز.) دا کاریگەرێکی زۆریان لە سەر ئایین و

میتۆلۆژیاو کولتووری حیشیان دا هەبووە، هەر وەکو لە نێو شوێنەواری نووسینیان دا دیارە.

یەکەمین هێمایەکی، کە بۆ ئورارتویان کرابێت لەو تابلۆ ئاشووریبیەدا هاتووە، کە بۆ سەدەی سێزدەمی پ.ز دگەڕێتەوە ئەو شوێنەوارانەی کە لە کوردستان و ئەرمەنستان دا لەم سالانەی دواییەدا دەست کەوتوون، ئەوە دەسەلمێنن، کە ئورارتویان لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکی پ.ز.دا هێزێکی ڕامیاری زۆر بەهێزیان پێکهێناوە.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بگوترێت، کەوا مانێکان، کە لە باشووری ئورارتووەکان دەژیان، لە سەرەتای هەزارەی یەکی پ.ز.دا ئەوانیش بە هێزێکی ڕامیاری دی بەهێز لە نێو هەرێمی کوردەواری بە تایبەت لە ژێرووی گۆمی وورمێدا دادەندران و هەمیشەش لەگەڵ ئورارتووەکان دا لە گێرمەو کێشەدا بوون، لە ئەنجامدا ئورارتووەکانیان ئەو ناوچانەی سەرووی زێی گەورەو چەند هەرێمێکی دی کوردستانی ئێران و عێراق بخەنە ژێر رکێفی خۆیان و ئەو هەرێمانەی، کە لە دەوروبەری ڕەواندزی ئەمڕۆیە ئەوسا لەلایەن ئورارتویانەوە زۆر پیرۆز بوو، چونکە پەرستگەی خوداوەندیان (خالدی) لەوێدا بووەو ئورارتویان ئەو شوێنەیان بە ئەردینی نێو نابوو، بەلام ئاشووریان بە نێوی موساسیر نێویان بردووە (د. جمال رشيد أحمد و د. فوزي رشيد- ١٩٩٠).

لێرەدا هەر زۆربەی ئەو شوێنەوارانەی نووسراو بە زمانی خووری دەخەمە ڕوو، چونکە شوێنەواری دییان بەزمانی ئەکەدیش هەبووە:

شوێنەواری نووسراوی پاشای خووری تیش ئەتەل (۲۰٤٥-۲۰۳۷ پ.ز)دا بووەو پەرستگەیەکی بۆ خوداوەند نرگال دروست کردووە (ئەفسانەی پاشایەتی لە ئاسمان دا، کە زۆرانبازی نێوان خوداوەندی خووری ئالالو لەگەڵ خوداوەندی ئانۆی سومەری و چەند خوداوەندێکی دی دەخاتە ڕوو.

ئەفسانەی گلگامشی سومەری، کە بە زمانی خووری نووسراوەتەوە لە حەتوسا (بوغازکوی) دۆزراوەتەوە.

چیرۆکی ڕاوچی (کەشی) بە هەردوو زمانی خووری و حیثی نووسراوەتەوە (Filhelim 1992)

کۆمەڵێک نامەی پاشای میتانی-توشراتە، کە بە زمانی خووری نووسراوەو بۆ ئامون حوتوبی سێیەمی لە سەدەی چواردەمی پێش زایینیدا ناردووەو لە (تل العمارنە)دا دۆزراونەتەوەو هەروا تێکستی خووری، کە بە ئەلف و بێی ئەکەدی نووسراون لە ئوگاریت دا دەست کەوتوون، دیسان ژمارەیەکی زۆری تێکستی خووری، کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕووی نێوەڕۆکەوە بەندیواری بە پەرستنەوە هەیەو پارچەکانی ناتەواون، لە ئارشیفی پاشای حیثی لە بوغازکوی لە ئاسیای بچووک دا ماونەتەوە.

لە ناوچەی نوزی، کە کەوتووەتە نێزیک کەرکوک کۆمەڵێک تابلۆ بە زمانی خووری دۆزراونەتەوە (د. جمال رشید- ۱۹۸۸)

هەروا لە ئەنجامی ڕووخان و داتەپینی لایەکی کەلای کەرکوک، کۆمەڵێک تابلۆ بە دەرکەوتن، کە خوورین و سەر بە بنەماڵەی وولوه (Groz 1988)، هەر لە کەرکوک دا کرمەڵێک نووسراوی خووری دۆزرانەوە، کە بۆ خێزانی تیخیب تیلای خووری دەگەڕێنەوەو بە زمانی خووری و بە نووسینی مێخی نووسراون (Gadd 1920)، لە دەشتی بیستوێن داو بە تایبەتی لە شمشارە (شوشارە) چەندین تابلۆی مێخی، کە بە زمانی خووری نووسرابوونەوە لە ئەنجامی پکشنین دا بەر چاو کەوتن، هەروا چوار میلی خووری لە ناوچەی بێتواتە دەست کەوتوون و ئێستەش پەرستگەیان لە شوێنێکی بەرز لە سەروچاوە لە بێتواتەدا هەر ماوە (د. جمال رشید- ١٩٨٨). دواترین شوێنەواری نووسراوی خووری بۆ سەدەی چواردەو سەرەتای سەدەی دوازدەی پ.ز. دەگەڕێتەوە.

شـــوینەواری نـووســــراو بە زمـــانـی ئورارتوو لە زۆربەی ئەو هەرێمـانەدا دۆزراونەتەوە، کـە دەسـەڵات داریتـیـیـان بە سـەردا هەبووە، کە ئەم خـاکە فـراوانەی گرتبووەوە- لە فـوراتەوە تا بەری باشووری وورمێ لە شاری مووشەوە تا گۆمی سیڤان و باشووری سنووری گورجستان.

لە ئەنجـامی پشکنین دا (٤٠٠) چوار سەد نووسراو بە زمـانی ئورارتوو دەسـتکەوتوون، کـە پێـوەندییـان بە مـێژوو، بنیـادنان و پەرسـتنەوە هەیە، هەروا دە نامـەیەکـیش، کـە زۆربـەیان بۆ پاشـا ئەرگیشتی یەکەم و سەردووری دووەم دەگەڕێنەوە چنگ کەوتوون.

پاشـا ئیـشـپـوینی کـوڕی سـەردووری یەکـەم (لە دەوروبەری ٨١٤-٨٠٦ پ.ز)دا شـــوێنەواری بە زمـــانـی ئـورارتـوو جێ هێـشـتـووە، بە تایبـەتی باسی ئەو هێـرشـانەی، کـە بۆ باکـووری وولاتی خـۆی کـردووە لە سـەر ئەو بەردە نوسـیـوە، کـە بەرەو دۆڵـی (دەلی بابا) دەچێت، هەروا شـوێنەواری نـوسـینی لە بارەی ئەو هێرشەی بۆ هەرێمی پارسوا لە باشووری گۆمی وورمێ دا کردووە، ئیشـپوینی لە لای کیلەشینیش نـووسراوێکی بە زمانی ئورارتو و ئاشووری دا بۆ بەجێ هێشتووین، کە باسی ئەو ڕۆیشتنە دەکات، کە مینەوای کوڕی بۆ موساسیری کردووەو ئەم شوێنە پەرستگەی خوداوەندی مەزنی ئورارتویان (خالـدی) بووەو سەد کیلۆمەترێک لە سـەرووی شاری هەولێـرەوە بووە، ئەم بەردەی کێلەشین ئێـستـا لەبەر دەرگەی moozەخانەی وورمێ لە ئێران دا داندراوە.

سەرەتای لێکۆڵینەوە لە زمانی خووری بۆ کۆتایی سەدەی رابردوو دەگەڕێتەوە، ئەوە بوو کە لە ساڵی ١٨٩٠دا بابەتێک لە ژێر سەردێری (نامەکانی میتانی)دا لەلایەن گ.خ. ڤینکلیارو ل. ئابیل دا بڵاوکرایەوە، بەڵام لەبارەی زمانی ئورارتو کۆنترین باسێکی چاپکراو دیسانەوە هەر بۆ سەدەی هەژدەم دەگەڕێتەوە، کە لە ساڵی ١٨٢٨-١٨٢٩دا ف. شولیچ بابەتێکی لەسەر زمانی ئورارتودا پەخش کردەوە لەو کاتانەوە تا ئێستا دەیان بەرهەمی زانستی بە زمانانی ئەڵمانی، روسی و ئینگلیزی دا لەلایەن دەیان خووریلۆژو ئورارتولۆژاندا بڵاوکراونەتەوە (م.ل. خاجیکیان- ١٩٨٥).

# پێوەندی نێوان
# زمانی خووری و زمانی ئورارتوو

هەروەکو لەمەو پێش هێمام بۆ ئەوە کرد، کەوا دەسەڵات دارێتی ئورارتوویان لەو دەوڵەتە بچووکەی، کە دانیشتووانی خووری زمان بوون و نێوی دەیاوخی بوو پێکهات و خۆشیان بە خۆیان دەگوت بیاینا، کە شێوەی کۆنی بە زمانی نێوچەییان بیاینیلە بووە. ئەو گۆڕینەی لەم هەرێمەدا رووی دابێت هەر لە رووی شێوەو نێوی دەسەڵات دارێتیان بووە، بەڵام زمانی مەردمەکەی هەر یەک بووە، کە خووری بووە، هەڵبەت زمانی خووریش وەک هەر زمانێک چۆن کاریگەری لەسەر زمانی دی هەبووە، لە هەمان کاتدا زمانانی دەوروبەریشی کاریگەرییان لەسەریدا هەبووە، بۆیە ئەو زمانە خوورییەی، کە لەگەڵ پەیدابوونی مێژوودا هەبووە، چۆن ئەو زمانانە نەبووە، کە لە دەوڵەتی گوزانەوە یا دەیاوخی دا بەکار هاتووە، چونکە هەر زمانێک دووچاری هەموو جۆرە گۆڕانێک بوەو دەبێت.

لێکۆڵینەوەکانی نوێ ئەوەیان پێشان داوە، کەوا نووسینی ئورارتوو لە نوسینی خوورییانەوە پەرەی سەندووە، کە بۆ هەزارەی دووی پ.ز. دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەم نووسراوانەی ئورارتوو لە ژێر کاریگەری نووسینی ئاشووریدا هێندێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

کارکردن لە دۆزینەوەی پێوەندی نێوان هەردوو زمانی خووری و ئورارتو بۆ لێکۆڵەرەوان کارێکی ئەوەندە سانا نەبووە، چونکە ئەو بابەتانەی بە زمانی خووری نووسراون بە شێوەیەکی سەرەکی

لەبارەی پەرستن و دەنگ و باسی پاشایەتی کۆشک و باڵەخانەیە، بەڵام ئەوانەی بە زمانی ئورارتوو نووسراون لەبارەی جەنگ و بنیادنانە.

زمانی خووری و زمانی ئورارتو لە رووی قۆناخی مێژووییاندا بە باشی نەخراونەتە ڕوو، تەنێ نووسراوانی کۆنی خووری، کە لە ئورکیش دا دۆزراونەتەوە، تاڕادەیەک لە هێندێک لایەنی زمانەوانیدا لە زمانی ئورارتوو نێزیکە، تێکستەکانی دی خووری بەبێ ئەوەی تەماشای جیاوازی ئۆرفۆگرافی ناوچەیی رەگەزانی ناوچەیی تایبەتێتی زمانەوانی هەمووی بە شوێنەواری یەک قۆناخی پەرەسەندنی مێژوویی دەژمێردرێن، هەروا لە نێو تێکستەکانی ئورارتووی سەدەی (I X و V I I پ.ز.)دا هیچ جیاوازێکی گرنگ و دیاریکراو نییەو هەر تەنێ دوو- سێ تێکستی لێ دەربچێت، کە تایبەتێتێکی کەمی دیالێکتی پێوە دیارە.

(Melikishvili 1954)

# فۆنۆلۆژی و فۆنۆتیکی
# زمانانی خووری و ئورارتوو

بە بەڵگە ئەوە روونکراوەتەوە، کەوا چۆن لە زمانی خووری، ئاواش لە زمانی ئورارتوودا فونیم هەبووە، کە بۆ دەربڕینیان نووسینی میخی ئەکەددی پڕ بە پڕیان نەبووە، بۆیە ئێستاش ساخکردنەوەی کێشەیەکە لە ئارادایە.

بۆچوونێک باسکراوە، کەوا لە زمانانی خووری و ئورارتودا سێ نەبزوێن تێکڕا هاتوون، بە تایبەتی لە زمانی ئورارتودا سێ نەبزوێنی کپ، ئاوازە دارو گران یەک لە دوای یەک هاتوون، بەڵام نەبزوێنی دووپاتەکراو لە زمانی ئورارتوودا نەماوەو لە دەست دراوە، کە لە زمانی خووری دا هەبووە (baba, babba < pappa - کێو)

لەگەڵ هەبوونی ئەو زەحمەتییانەش تواندراوە ئەم خشتەیەی ژێروو بۆ سستێمی فۆنۆلۆژی هەردوو زمانی خووری و ئورارتوو پێک بهێندرێت:

خووری- ə,u,o,i,e,e,a

ئورارتوو- ə,u,o,i,e,a بڕوانە:

(Speiser 1941, Diakonoff 1967, 1986)

بزوێن بۆی هەبووە لە ڕووی جۆرێوەی بگۆڕێت وەک: (o <- i) (e / لە پێش ɣ ,(a<ḫ) lla , tta دا، وەیا لە نێو دەچێت لە پێش فۆرمانتی دۆخی خستنە سەردا هەر وەکو we لە نێو چووە Nuza - شاری نوزا //نوزی Nuz - we، هەروا لە کاری

-tan - ož - i wa - af من نەم کـــرد a - لە نێـــوچووەو
شێوەکەی بەم جۆرەی لێهاتووە: tanoziuf، دیسانەوە لە پێش
ne -ی نسـبی دا paba - کـێـو، شـاخ pab - nə کـێـوی،
شـاخی، لە دوای (n,r,l)دا، کە (na - )ی نسـبـیـان لەگـەڵدا
هاتووە وەک šawala - ســاڵ - šawal < šawala - na
na ئەم لە کاریشدا بەرچاو دەکەوێت kul - i - l - e بمگوتبا،
tadugar، خۆشەویستی پیشان دا، tad - ug - ar -i - ewe
- < rewa لە ئورارتوشـدا هەمـان جـۆرە - Š/zad - itu /o
Ṣ/zatu o-me < me دایانە من، بە منیان دا.
زۆر جار -a- لە کۆتایی وشەی ئەبسۆلۆتدا لە نێوچووە، -Gal
gamiz - ūš- lla گـەلگامش ئەوانی (کـرد)، لە دوای
قۆناخێک دا بەم جۆرە گۆڕاوە، Galgamiž-ull.
لە زمانی ئورارتوودا دیفتۆنگ بۆ یەک بزوێن گۆڕاوە Bia
ñāwe < Biaina-wə فـونیـمی (r)ی لە زمـانی ئـورارتوودا
گـۆڕانکارێـکی زۆری بەسـەردا هاتووە کـە کـەوتۆتە پێش بزوێنی
(a)ی هێزدار، لە دوای دەنگی (r)دا دەنگی [?h=] پەیدا بووەو
لە ڕووی گرافیکێوەی وەک پارچە بوونی بڕگە پیشان دراوە (-tar
-a-e توانایی) بزوێنی بێ هێـزیش لە دوای (r)دا لە نێـوچووە
/p̄ar-u-b-ᵛə، بەڵام p̄ar-ito < parto.
وا دیارە لە زمـانی خووریدا دوو (e) هەبـووە، کە یـکێـکیـان لە
مـیتـانیـدا شێوەی (-e-e)و لە بوغـاز کوێی و لە مـاری دا (-e)ی
نواندووە، لە ئورارتوودا (i)ی بۆ داندراوە، کە لە میتانیدا شێوەی
(e) و لە ماری و بوغازکوێی (i) بووە.

دەنگی (0) لە زمـانی ئورارتوودا لەچاو دەنگی (U)دا زێتـر بەکار هاتووە، لە زمانی میتانیدا نیشانەی (Ku/Ko (U/Oی بۆ داندراوە، لە هێندێک تێکستی خووری و ئورارتوودا هەردوو دەنگی (0)و (u) لێک جوداناکرێنەوە

(Seiser 1941, Diakonoff 1967, 1986).

نەبزوێن لە زمـانی خـووری و ئورارتوودا لەم شـێـوەی ژێروو پێکهاتوون و هەڵبەت هێژ لە لایەن لێکۆڵەرەوانەوە هەر بە تیۆری دادەندرێت، چونکە لە هەموو بارێکدا بەڵگەدار نین:

خـــووری:

---

[pp , b//p] گرافیکی [pp , b/p]
[m ,w,f] گرافیکی [w ,ww وەیا u, m]
[tt , d/t] گرافیکی [tt,d//t]
[n ،ع،c̄,zz, ؛s] گرافیکی [z//š, šš zz, //? s]
[؛L] گرافیکی [L,LL]
[rh] گرافیکی [r]
[j] گرافیکی [j وەیا i]
[g//k] گرافیکی [g,k]
[ ,h,kk,kh] گرافیکی [ḫ,ḫḫ,kk,ḫ//k]
[؛h] گرافیکی [ḫ]

ئـــورارتـوو:

[b, p, p] گرافیکی [b, b, p, p]
[m, w, ] گرافیکی [m, u̯, u̯]
[d, t, t] گرافیکی [d, t, t]
[(?/),ç< ? č), c, s (? ž), ? š]
گرافیکی [(? z), z, (?s), s̈, š, (?s̄), s, d, t, t]
[Z] گرافیکی [Z]
[r//rh] گرافیکی [r]
[j] گرافیکی [j, i//g]
[ḫ,h,?g, k, k] گرافیکی [ḫ, ḫ, ?g, ḳ, k]
[??h] گرافیکی [ʾ] (Diakonoff 1967)

هێندێک بنچینه هەن، بۆ ئەوەی وای بۆ بچن کەوا p/b و t/d و k/gی خووری هەمیشە لەگەروو یا لەگەڵ ئەودا گذکراون و دەربڕاون و هەروا ئەمە بە تەواوی و ڕاستی لە z̄و s̄دا بەدیار دەکەوێت.

pp ی خووری (هەمیشە کپ بووە)و لەوانەیە بۆ p̊p وەیا بۆ b̌b بگەڕێتەوە، لە ئورارتودا چەندێتی نەبزوێن پارێزراوە، بەڵام نەبزوێنی دوبارەکراوەی نەپارێزراوە: خووری- paba جۆرە شێوەیەکی pappə یە کێو/شاخ (> babba baba)- ئورارتوو baba-na و bam-na - کێو/شاخ. لە زمانی خووریدا w بە دوو جۆر هاتووە، لەگەڵ نیشانەیەکی بڕگەیی تایبەت، یا لەگەڵ بزوێنێکی نیشانەدراودا بۆ U ، گرافیکی هەرە

دوایی لە زمانی ئورارتوودا تایبەتیتی خۆی هەبووە، فۆرمانتی خووری لە دۆخی خستنەسەردا U-e-waی لەگەڵ هاوچەشنەکەی لە ئورارتوودا [w∂= -U-e] بەراورد بکە.

d/t و ttای خووری و t,t,d ی ئورارتوویی دیسانەوە بۆ یەکبوونی تیپی دووبارەکراو دەگەڕێتەوە هەر وەکو لە خووریدا /b p و لە ئورارتوودا ,p, b p یە، کە بۆ هەمان دەنگی لێوی دەگەڕێتەوە.

دەنگی Š ی خووری، کە لەگەڵ z̄ دا ڕێک دەکەویت لە ڕووی گرافیکەوە S̄ ی یا Zی بۆ داندراوەو لە ئورارتووشدا نیشانەی Sی بەرامبەریتی، کە هەر وەکو (ژ)ی کوردی دەخوێندرێتەوە، دوور نیە دەنگی (ꜩ)ی نێوان ددان وەیا (Ż)ی ئورارتوو لەگەڵ (S̄)دا هەر هەمان دەنگ بن، ئەمانە بەراورد بکە: خووری -az، ئورارتوو -as، خووری ḫaž گوێ لێ بوون، ئورارتوو ḫaš، (S̄)ی ئورارتوو بە هەموو بۆچوونێک فیکەدار بووە، لەگەڵ ئەوەی هەر تەنێ دوو (s)ی وێکچووی ئورارتوو لە زمانی خووریدا هەبووە، کەچی نەگونجاو بوون.

S ی خووری بە تەواوی تێکەڵاوی دەنگی کپی C̄ بووەو لەوانەیە وەکو (tš گۆکرابێت)، بەڵام گرافیکی Z تێکەڵاوی ئاوازەداری ج / /dž بووە.

LL ی خووری بە شێوەیەکی کپی L دادەندرێت، وەیا هەبوونی بە جۆرێ دووپاتکراوە نازاندرێت، هەروا (nn, mm, rr)ی دووپاتکراوە وەکو فۆنیمێکی سەربەخۆ لە خووریدا بەرچاو ناکەون لە ئورارتوودا بەرامبەرەکەی هەر (n, m, r).

له زمانی خورری و ئورارتووشدا (R) له سەرەتای وشەدا بەکار نەهاتووە (جگە لە یەک دوو رووداوی شک لێکراودا نەبێت، کە لە نێو تێکستەکانی بوغازکوێیدا لە وشەی وەرگیراوی ئەکەدیدا بۆ نێو زمانی خووریدا بەرچاو دەکەون، وەک: Ruša لە ئورارتوودا، بەڵام هەر وەکو لە ترانسکریپچی ئەکەدیدا پیشان دراوە لە قسەکردندا وەکو Ufsā گۆکراوە. وا دیارە (R) لە زمانی خووریدا ئەوەندە بە سڤکی گۆکراوە ماوەی لە نێوچوونی هەبووە.

g//K و KK لە زمانی خووریداو K (q) ,g لە زمانی ئورارتوودا بارەکەیان هەر وەکو ئەوانەی پێشووەو بۆ k.k.g و هەروا بۆ kk, gg, kk دەگەڕێتەوە.

جووتە ḫ ,ḫḫ ی لە رووی گرافیکەوە لە خووریدا ئاوازەدارو کپ بووە (؟) دوور نییە دەنگی (h)ی، کە بە یارمەتی گەرووەوە گۆدەکرێت لە زمانی خووریدا هەبووبێت، بەڵام تایبەتێتی فۆنیمی ئورارتوو ئاشکرا نییە.

لە زمانی ئورارتوودا لە پێکهاتنی وشەدا گۆڕین لە دەنگی نەبزوێن دا کەم رووی داوە.

هێز لە زمانی خووریدا بە تەواوی روون نەکراوەتەوە، لەوانەیە لە کۆتایی ئەو وشەیەدا بووبێت، کە کەوتۆتە ژێر کاریگەرێتی چەند تیپێکدا، لە زمانی ئورارتوودا هێز کەوتۆتە سەر بڕگەی هەرە دوایی، ئەمەش لە ئەنجامی سووک بوونەوەی بزوێنی بێ هێز لەسەر هێزداردا پێکهاتووە، بەڵام لە نێودا کەوتۆتە سەر بڕگەی پێشتری بڕگەی هەرە دوایی و لەو کاتانەشدا، کە بە (a) کۆتایی

هاتووه هێز کەوتۆتە سەر دوا بڕگە، بۆ وێنە لە زمانی ئورارتوودا، کە (r) یّ کەوتۆتە پێش بزوێنی (a) ی هێزداردا دەنگی (h ؟)پەیدا بووە ، کە ئەویش لە رووی گرافیکەوە وەک پارچە بوونی بڕگە پیشان دراوە (tar-a-e- توانایی)، بزوێنی بێ هێزیش لە دوای (r)دا لە نێوچووە: par-u-b/v بەڵام parto par<-ho ئەگەر دەنگی (L) لە دوای دەنگی (Ṙ)دا هاتبا ئەوا دووچاری گۆڕینێکی هاوجۆر بووە:

Sepūial <šep- ui- ar- u- l-e

(Benedict 1962. Diakonoff 1967, 1986).

# وشەی فەرهەنگی
# و
# وشەی دارشتن

وشەی فەرهەنگی هەردوو زمانی خووری و ئورارتوو هاوجۆرن ٢٠٪ی وشەی ئورارتوو هاوچەشنی وشەی خوورییە، ئەگەر زاراوەی تایبەت بە ئایین و کولتووریانەوە، کە ١٠-١٥٪و هەروا وشەی خواستەمەنیشیان لێ دەربهێنن، کەنێزیکەی ٥٪ ئەوە رێژەی وێکچوونیان دەگاتە ٢٥٪ بەڵام ئەگەر ئەوە بژمێردرێت، کەوا ئەو وشە فەرهەنگیانەی سەر بە زمانی خووری و ئورارتوون لەو تێکستانەدا هاتوون، کە لێک جیاوازن، ئەوە بە هەموو بیرو باوەڕێکی لێکۆڵەرەوانەوە وا دەبیندرێت ژمارەی ئەو وشانەی چۆن یەکن زۆر زێترن. لەو وشە خواستەمەنییانەی کەوتوونەتە نێو زمانی خووری وشەی سومەری و ئەکەدین: سومەری -zu-luma - خورما > خووری -zilumpa ، ئەکەدی -tamkar-um - سومەری -dam- gar > خووری -tamgar - بازرگانی، ئەکەدی - šarrum- پاشا > خووری - zarra ، سومەری - dub > ئەکەدی tuppum > خووری - -tuppi- دۆکومێنت. و هی دی.

هێندێک زاراوەی تایبەت، کە بەندیواری بە ئەسپ بە خێوکردنەوە هەیە لە زمانانی هیندو ئەورووپێوە خواستراوە، وەک: خووری marianne - مێرینی، میرانی، نێوداری، بەڵام وشەی mari - ئورارتوو واتای نێوداری گەیاندووە.

پێکهاتنی وشە لە هەردوو زمانی خووری وئورارتوودا وەک یەکن، وشە برێتی بووە لە رەگێکی لێکدراوە بۆ وێنە -ag گەیاندن، راپەڕاندن ,ha̭ -گرتن، ĝē (خووری - ke، ئورارتوو (g/iē- پارێزراوە، tan - کردن، سازدان، en ئورارتوو -in - خوودێ، یەزدان q̌awr (خووری - haw(n)، ئورارتوو (qewŕā- زەوی، خاک، mann -مان، هەبوون، fah̭r (خووری) چاک بێت، بەفەڕ بێت.

هەر وشەیەکی رەگەکەی کۆتایی بە دوو نەبزوێن هاتبێت وا شکی لێ دەکرێت، کە یەکەمیان تایبەت نەبێت و لەوانەیە نەبزوێنی هەرە دوایی بە فۆرمانتێکی کۆن دابندرێت بناخەیەکیش سەرەتاکەی لە دوو نەبزوێن پێکهاتبێت هەروەکو دیارە لە زمانی خووریدا هەبووە، لەوانەیە لە ئەنجامی کاریگەری هێزدا پەیدا بووبێت.

نێو هەروا ئاوەڵنێویش بۆیان هەبووە زیادەیان لەگەڵدا هاتبێت هەروەکو لەم وشانەدا دیارە:

(u)bad - ئاوەڵنێوە، بە واتای زۆر لە خووریدا لەگەڵ nir هاتووە nir - ubad - ae زۆر خێرا - nir - ae - خێرا.

ahɣ - ئاوەڵنێوە -nap - ah - خامۆشکردن، هێمن کردن، at - h - دیتن.

u/ oh - ئاوەڵنێوە - خووری his/u/oɣ خیسەکردن ئازار دیتن.

بناخەی کار لە رەگ وە لە رەگ و زیادەیەک پێکهاتووە، پاشگرێکیش کەوتۆتە دوای ئەم زیادەوە، کە بزوێنێکی تیماتیکی

بووه، بزوێنی - i وەیا - e - بە شێوەیەیکی سەرەکی دەوری بزوێنی تیماتیکیان بینیوە (شێوەی نووسینیان رێگەی نەداوە لێک جودا بکرێنەوە) بزوێنی تیماتیکی - o - تایبەت بووە بە نێو وەیا نێوی رووداو، بەڵام بزوێنی - u - دەوری تیماتیکی نەدیوە بە گشتی، بزوێنی - a - شوێنی دیاریکراوی خۆی هەبووە، بە تایبەت لەگەڵ زاراوەی واتای خزمایەتی گەیەنەر بۆ وێنە: خووری atta-باوک، amma - دایک، z̃ena - برا، ela - خوشک، sala - کچ (بەڵام fundg کوڕو ašti ژن)،، لە ئورارتوودا səld -کچ -ە، هەروا بزوێنی -a- لەگەڵ زاراوی جوگرافیشدا هاتووە: خووری - -paba کێو، šeia - ئاو. رووبار، ئورارتوو -baba - no- کێوان qawra - زەوی، گەرد، muna - رووبار، alga - سنوور، هەر دیسانەوە بزوێنی -a- رۆڵی تیماتیکی لەگەڵ نێوی خوداوەندانیشدا بینیوە، بەڵام هەر تەنێ لە زمانی ئورارتوودا ,Queŕā, Ḫúba Teišəb, Tusp(u)wēā و هی دی و لە زمانی خووری دا هەر لەگەڵ خوداوەندی Sawuska دا هاتووە، ئەوەی شایەنی باسە زۆربەی هەرە زۆری خوداوەندانی خووری بزوێنی -a- کەوتۆتە کۆتاییانەوە.

وشەی لێکدراو زۆر بە کزی لە هەردوو زمانی خووری ئورارتوودا پێکهێنراوە، لە هەردوو زماندا ئەم وشە لێکدراوانە تێبینی دەکرێن: خووری -i- att(a) - ar - d- دیاری باوک el(a) - -ar -d -i , دیاری خوشک (هەروا نێوی خوداوەندی - مانگ - یش - Šelada ؟ بەر ئەم کۆمەڵە دەکەوێت)، لەگەڵ نێوی

کاریشدا بەکارهاتووە، لە ئورارتوودا نێوی کاری وەک - - abili d یەکگرتن بەرچاو دەکەوێت، کە abili-ی نێو یا جێ نێو، بەڵام -d- کارە، کەچی دەتواندرێت ئەم شێوانە بە پێچەوانەش روون بکرێنەوە.

(Speiser 1930, 1941. Diakonoff 1967, 1986. Barnett 1974. Khajikyan 1985).

# نێو

لە زمانی خووری و ئورارتوودا نیشانەی کۆ، نیشانەی ناسیاری و نەناسیاری هەروا نیشانەی دۆخیش بەکارهاتووە، نێو ڕەسەنی نەبووە، بەڵام لە رووی تاک و کۆدا جیاوازی هەبووە.

نیشانەی ناسیاری شوێنی یەکەمی گرتۆتەوە، جا نیشانەکانی دی پێوە لکاوە، نیشانەی دۆخ کەوتۆتە هەرە دوای نیشانەکانی دی.

نیشانەی کۆ برێتی بووە لە (a-) یان (-aẑ) لە زمانی خووریدا بە زۆری (-aẑ) بە کار هاتووە، بەڵام (a-)ش بەرچاوکەوتووە، لە ئورارتوودا (-az) وەکو پاشماوەیەکی زمانی خووری دەوری گێڕاوە، بەڵام (a-) رۆڵی سەرەکی نیشانەی کۆ بووە.

ژمارەی دۆخ لە زمانی خووری و ئورارتوودا جیاواز بوون، بەڵام لە رووی بنچینەوەو نیشانەکانی دۆخدا وێکچووبوون پێوەندی بە یارمەتی پاشگریش دەربڕاون، کە زۆربەیان لە بنەڕەتدا نێو بوون و بوون بە پاشگرو لەو بارەشدا نەماوون و بوون بە نیشانەی دۆخ وەک: edi شت، هیچ، کە لە زمانی خووریدا هێژ وەکو نێویش بەکار هاتووە، ئەگەرچی لە رووی ئەرکەوە لە دەوری گۆڕیندا بووە بۆ بوونی بە ئاوەڵکارجا پاشگر، لە ئورارتوودا - edo وەکو نیشانەی دۆخی رێچکە - ta > - te بەکار هاتووە، باوەکو شێوەی سەربەخۆشی هەبووە.

پاشکۆی ئامرازی پێوەندی بۆ زێتر چەسپاندنی پێوەندی دۆخدا بەکارهاتووە، کە زۆربەی ئەم پاشکۆیانە لە نێوەوە وەرگیراون و

وەکو نیشانەی دۆخیش بەکارهاتوون (Sasson 1975)
لێکۆڵەرەوانی زمـــانی خــــووری و ئورارتوو هەر ئەم چەند ژمارانەیان لە نێو تێکستی ئەم دوو زمانەدا بۆ ساخ بۆتەوە:

خــــووری:

---

Šin -٢
Kig -٣
tumni -٤
Šitta , Sinda -٧
niza -٩
eman -١٠
Kizə -٣٠
(i) nu / obe -١٠٠٠٠

ئــورارتــوو:

---

sise -٢
aiba -١٠٠٠٠

## جـــێ نـــێـــو

جێ نێوی کەسی جودا بۆ کەسی یەکەمی تاک لە زمانی خووریدا is - و لە زمـانی ئورارتوودا jes بووە، بەلام هەرگیز بە تەنێ بەکار نەهاتوون، بەڵکو هەمیشە نیشانەی دۆخیان پێوە لکاوە وەک نیـشـانەی da , - wa, -we , -s̄ , -te- بۆ دۆخی ئەبسۆلوت، بزر، خستنەسەر، مەبەست و گواستنەوەدا لە زمانی خووری دا. لە زمـانی ئورارتوودا هەرسێ جـۆرە نیشـانەی دۆخ ناسراوە، کە ə بۆ ئەبسـۆلوت و بزر و ukt - یش بۆ دۆخی مەبەست.

جێ نێوی کەسی لکاو بۆی هەبووە بکەوێتە نێو فۆرمی کار یا لەگـەڵیدا هاتووە وەیا بە هەر چ وشـەیەکی دییەوە لکاوە، لەو بارانەدا، کە بە کارەوە لکاوە رۆڵی سوبێکتی گێراوە. خووری fas̄ - i - b- ئەو دەنێـریت، ŭn - a -iâ -ân ئەوان دێن. ئورارتوو - ust - a - de من هێرشم برد ust-a-lə ئەو هێرشی برد، هەروا جێ نێوی کەسی جودا رۆڵی ئۆبێکتیشی گێراوە، کە لەگەڵ کار هاتووە - Kulôza - ta - an .. hazôz̄av - n - a- an ئەو بە منی راگەیاند // گوێم لێی بوو.

لە هەردوو زمـانی خـووری و ئورارتودا جێ نێـوی دیاری - ol یەکـێکی دی و - sue // a هەمـوو (لە زمـانی ئورارتـودا واتای یەکێکی دیشی بەخشیوە) بەرچاو دەکەوێت.

harh arsuvə Eratelə ol ə hauve من کـەلام رووخاند (شاری) ئیراتیلە، ئیراتیلیەکی دیم داگیرکرد.

لــەبــەر anů dansue - ne - dan - tadugari dil ån
ئەوانە هەموو ئێمە یەکترمان خۆش دەوێت.
جێ نێـوی نادیار inå - هەرکەی لە نێو تێکستەکاندا بەرچاو
کەوتووە: inåm å man - هەرکەی بێت.
جێ نێــوی هەیی لە هەردوو زمــانی خــووری و ئورارتوودا لە
شێوەی لکاودا هاتووە:
خووری - (iww (if -بۆ کەسی یەکەمی تاک، hww - až-
بۆ کەسی یەکەمی کۆ، -w/ - 𝒱 بۆ کـەسی دووەمی تاک، - / i
/ i - a بۆ کـەسی سـێـیـەمی تاک و - az - /i بۆ کـەسی
سێیەمی کۆ.
ئــــورارتــــو:-
uke - uke- بۆ کەسی یەکەمی تاک، w- بۆ کـەسی دووەمی
تاک و(i (a / و i / a / بۆ کەسی سێیەمی تاک.
جێ نێـوی نیـشـانە لە هەردوو زمـانـدا جـیـاوازن، لە زمـانی
خووریدا بۆ پیـشـاندانی شتی نێـزیک andi- و بۆ شتی دوور -
anni بەکارهاتووە، هەروا بۆ هەمان واتا جێ نێوی // manne
manaش هەبووە.
لە زمانی ئورارتوودا بناخەی - ina- لەگەڵ سێ جۆرە کۆتاییدا
بەکـار براوە: - ina - uke ئەوەی من، ئەوەی نێـزیک، - ina-
na ئەمە دیاریکراوە، بناخەی ika شی دەچێـتە سەر لە شێـوەی
ik - uka - na ئەمەی (دیاریکراو).
لە زمانی ئورارتوودا جێ نێوی نیشـانەی /a ئەوەی کە، ئەوەی
چی لەگـەڵ ئەو وشـەیەی، کـە بۆی دەگـەڕێتـەوە رۆڵێکی باڵای

هەیە:

a /ĕ SISKU s / zad - u - b/v - ئەو قوربانییەی، کە پێشکێشم کرد - ئەم جێ نێوە دەوری راستەخۆی گێڕاوە.

لە زمانی خووریدا تەنێ جێ نێوی پرسیاری awə کێ، ئورارتو - dû بەرچاو دەکەویت.

بۆ پیشاندانی جێ نێوێک، کە واتای خۆێتی لە هەردوو زماندا بگەیەنێت، نێو بەکار دێت، هەروەکو لە زمانانی کۆنی رۆژهەڵاتیدا باو بووە:

Iśtane)-ی خووری گەڕانەو بۆ خۆ، heiaru - nna - هەر کەسێک (بۆ خۆی) su (w) e، کە بەرامبەرەکەی لە زمانی ئورارتودا šui ی بووە واتای تێکرا، هەموو، هەمی گەیاندووە.

ئاوەڵنێو بۆی هەبووە هیچ جۆرە نیشانەیەکی ڕێزمانی پێوە نەلکێت بۆ ئەوەی لە نێو جودا بکرێتەوە بۆیە هەر بە ڕێگەی ئەرکی سینتاکسی تواندراوە لێک جودا بکرێنەوە، بەڵام هێندێک جار نیشانەی تایبەتی مۆرفۆلۆژی لەگەڵدا هاتووە:
// ȟurru / o - he - خووری -Lulla - he- لوولوویی، ȟurwo - he خووری، hlb g [halba - γe] حەلەبی ، ninwa-Rl [ninwa-γe ] نەینەوایی، ئورارتوو،- diau - hə تاووی، - etiu - ḫə - ئیتیخی، -sardurə - hə - کوڕ، نەوە، sure - š (ə) چەکدار، - sure چەک uri - š (ə) h ə مەخزەن، ئەنبار -uri - šə- ئامراز، چەک، ئەم وشەیە بۆ کاری - (ur چاندن دەگەڕێتەوە)و زۆری دی.
نیشانەی نسبی دیارخەری ne- لە هەردوو زمانی خووری و ئورارتوودا دەورێکی زۆر گرنگ دەگێڕێت بەوەی ئەو وشەیەی پێوەی لکاوە دیارخەرە جا چ لە ڕووی پێشاندانی تاکایەتی لە ڕووی کاتەوە پشتر زانرابێت، وەیا لەگەڵ نێوی دیارخەرو دیارخراودا بێت، وەک لە ئورارتودا: -Haldi - n ustab خوداوەندی خاڵدی (پێشتر ناسراوە) ڕۆیشت.
Rusā - na alusəTušpā - i pātar
رووسا (پاشایەکی - کەسێکی ناسراوە) فەرمانەدەی شاری توشپا Haldi - (i) n pura- na - خالدیانی دیل. -
ina - nə esi - ne - nə لەم شوێنەوە.

له زمانی خووریدا (ne) لەگەڵ دیارخەرو نێوی دیارخراویشدا بەکاردێت، یان هەر تەنێ لەگەڵ دیارخەردا ew(e)r - ne Mizir .پاشای (وڵاتی) لوولووییان - Lullue - ne - we re - we (Mizir - ne -we) u / o min (i) - ne - - tuppi nihar - re - we .میسو وڵاتی مەزنان we allae دۆکومێنتی داڕێژراو.

(ne) سەربەخۆش هاتووە، بەڵام وەکو نێوێک و رۆڵی دیارخراوی گێڕاوە - Muz̄(u)ne- جمک، دووانە. لە ئورارتودا ardi - nə لێرەدا مەبەستی موساسیرە، بەڵام بە تایبەت شار دەگەیەنێت لەگەڵ - (ardi شار)دا بەراوردی بکە، ئەم نیشانەیە لە شێوەی (na)دا بووەو لە هەمان کاتدا دیارخەریش بووە:

S̄awuska - we - (a)z - us s̄ije - na - (a) z - us̄ ئاو (خوداوەندانی) شاوشکا (کردوونی) بە واتا خوداوەندانی شاوشکا ئاویان پەیدا کردووە.

# ئامراز

ئامـراز لە زمـانی خـووریدا دابەش دەکـرێتـە سـەر دوو جـۆر: سەربەخۆ و لکاو.

ئامـرازی سـەربەخـۆ لە زمـانـی خووریدا برێـتی بووە لە: / - ai / ئەگەر لە لێکدانیدا لەگەڵ تیپی لکاودا بەم جۆرە داڕێژراوە:

ai - manin s̄ênif uz̄ anam tānȯziwal an a

ئەگەر برای من بەم جۆرە رەفتاری نەکردبا.

inu / لەبەر ئەوەی، ئاوا، suga / هەروا، چونکە، ئەوجا، - ina کە.

ئامرازی لکاو تەنێ بە زمـانی خوورێوە پێوەستەو بە شێوەیەکی زۆر فراوانیش دەگۆڕێت، ئامرازی لکاوی an- دوو نێوی لێکداوە وەک: Kelija - n mana - nn - an (ئەوە) کـەلـیـیـەو (ئەوەش)مـانی، یان دوو کـاری لێکداوە وەک: haz - oz - af - n من ئەوەم گـوێ لێ بوو، شـاد بووم، هەروا دوو رسـتـەشی لێکداوە.

ئامرازی لکاوی-a-an,-a, -an, -a -a -an (ma ش بەرچاو دەکەون.

ئامـرازی لکاوی جـیـاکـار زۆر بە فـراوانی لە زمـانی خـووریدا بەکارهاتوون، کە ئەمانەن:

-mmama(n) ئە ئەوە، ئەمـەو یەکـێکی دی نا، -nin ئە ئەوە، بەڕاسـتـی (؟)، -(a)nni هەر بە هەمـان واتا. ئەم لکاوانەو هەروا ئامرازی لکاوی -ma, - man لە بەکارهاتندا

تا رادەیەک بە وشەی یارمەتیدەری سەربەخۆوە دەلکێن:
-undu - man ،ئەگەر راست بێت، -ai - ma -nin
ئەمجارەش، ئاوا، وشەی andi و z یش لەگەڵ دەمکاتی
کارێکدا بەکارهاتوون بە مەبەستی چەسپاندنی روودانی ئەو
خواستەی دەیانەوێت بێتە دی.
لە زمانی ئورارتوودا ئامرازی سەربەخۆ کەمتر بەکارهاتووەو لەو
ئامرازانەی ناسراون: ئامرازی لێکدەری - ẽi لەوانەیە ئامرازی -
-mi یش /نا/ بەکار هاتبێت، هەروا ئامرازی گەیەنەر -ale/u
(ئەوەی) کە، -iu ئەگەر، کە، -āše-کە، (کاتێک) کە.
ئامرازی پێوەندی لە زمانی خووریدا نازاندرێت، بەڵام
پاشکۆکانی ناسراون:
- edi - ( > eda) تەن، شت.
- da- لەبەر ئەوە، بۆ، لە پێناو ئەوەی.
- dan- لە (بەرئەوەی).
-wə- واتای نسبی دەبەخشێت.
لە زمانی ئورارتوودا ئەم ئامرازانەی پوەندی هەن - para هەتا،
- ka(y) پێش، لە پێش.
لە زمانی ئورارتوودا ئەم پاشکۆیانەی ئامرازی پێوەندی
بەرچاوکەوتوون:
- edi- کە لەگەڵ نشانەدا بەکارهاتووە.
-ayə لەگەڵ - -awe و - -aye-ی خووریدا بەراوردی بکە،
واتای نەزانراوەو وای بۆ دەچن، کە واتای (پێش، لەپێش)ی
بەخشیبێت.

ə-aptin- (له لای ؟).
- asdu- له پێناو، بۆ.
ə-bed-/ -bedin- لەلای، له.
- ya - istina- له پێناو، بۆ.
(Benedict 1962. Salvini 1976, Filhelim 1992).

# نێوی کار

لە زمانی خووریدا سێ جۆرە نێوی بکەرو نێوی کراو هەبووە، نێوی بکەرو کراوی بار لەگەڵ پاشگری a- نێوی بکەرو کراوی رووداو لەگەڵ پاشگری i- دارێژراون، نێوی بکەرو کراوی بار وەکو ئۆبێکتی رووداو لەگەڵ پاشگری u- بە o- خوێندراوەتەوە.

فۆرمانتی a- و u / o- و i- لە ڕاستیدا نیشانەی بکەرو کراو نین، بەڵکو نیشانەی تێپەڕو تێنەپەڕن، بۆیە دەبێت بگوترێت، کەوا نێوی بکەرو کراو لە زمانی خووری و ئورارتوودا هاوبناخەبوون و نیشانەی تێپەڕو تێنەپەڕیشیان هاتۆتە سەر.

نێوی تایبەتی ئەگەر نیشانەی بچووک کردنەوەی ia- لەگەڵدا بەکارنەهاتبا ئەوا دەوری رستەیەکی تەواوی گێڕاوە، لە دارشتنی نێوی بکەرو کراودا لە زمانی خووریدا هەروا نیشانەیەکی تەواوکەریش، کە / b - / بووە بەکارهاتووەو وا دیارە ئەم نیشانەیە کۆن بووەو لە زمانە زیندووەکەشدا هەر ماوەتەوە، وەک:
Ag - i - b - Tessob- تیشووبی ڕێبەر.

فۆرمانتی نێوی ئۆبستراکت i / (s̄)s̄e)ی خووری و ǝs̄ی ئورارتوو رۆڵێکی گرنگ و جۆراو جۆری گێڕاوە: لەگەڵ بناخەی نێوێک، کە بۆ دارشتنی نێوی ئۆبستراکت بەکارهاتووە:

- erwi // ewri سەرۆک هۆز.
- ewri - s̄s̄e سەرۆکایەتی هۆز.
- Z̄arra - پاشا.
- Z̄arra - s̄s̄e - دەسەڵاتدارێتی پاشا.

tamgar - بازرگان.

tamgar - se بازرگانێتی، بازرگانێ.

هەروا لەگەڵ کاری گەردان کراودا لە ڕستەی شوێن کەوتوودا لە دوای ئەوەی، کە دەکرێن بە نێو، فۆرمانتی دۆخیان پێوە لکاوە، کە ڕۆڵی ئامرازی گەیەنەریان گێڕاوە:

i ja - lle - nin Zen - iff - uš̄ dube - na - man š̄uwa - lla - man keb - an - u / oz̄ - a - s̄s̄ - na ئەوانەی کە لە ڕاستیدا برای من (دۆخی کارا بزر)،(ئەوانە) خشتی بچووک هەموویانیش ئەوانەی، کە (ئەو) ناردنی = ئەو خشتە بچووکانەی، کە براکەم لە ڕاستیدا ناردنی.

(Mishaninov 1962, 1958, Benedict 1962, Sasson 1945).

# کار

کار لە زمانی خووری و ئورارتوودا دەمکاتی تێپەڕو تێنەپەڕو باری ئەرێ کردن و ناکردن و کەس و ژمارەی سوبێکت و ئۆبێکتی دەربڕیوە.

شێوەی کار لە هەردوو زمانی خووری و ئورارتوودا برێتی بووە لە بناخەی کارو زنجیرێک پاشگر، بناخەی کار رۆڵێکی گرنگی لە چەسپاندنی سیمانتیکی رەگی کاردا بینیوە.

لە زمانی خووریدا ئەم شێوە دەمکاتانەی ژێروو بەکارهاتوون:

١- دەمکاتی تەواو، کە بە یارمەتی نیشانەی u / oz- دارێژراوە.

٢- دەمکاتی ناتەواو، کە لەگەڵ نیشانەی ed-دا پێکهاتووە.

لە زمانی ئورارتوودا ئەم دەمکاتانەی ژێروو بەرچاوکەوتوون:

١- دەمکاتی گێڕانەوە، کە هیچ نیشانەیەکی پێوە نەلکاوە.

٢- شێوەی دەمکاتێک، کە نیشانەی t(a)- لەگەڵدا بەکارهاتووە.

٣- شێوەی دەمکاتێکی ناتەواو، کە بە یارمەتی نیشانەی ed- دارێژراوە.

نیشانەی تێپەڕ برێتی بووە لە - - i و - - u هەروەک nips -ed -u -li- -/e-nə دەبا بیکوژێت / دەبا سەری ببڕێت.

ar - (ed) d - i l a(e) - nə - بۆ ئەوەی ئەو بیدات.

بۆ دەربڕینی دەمکاتی تێپەڕی تەواو لە هێندێک دیالێکتی

زمانی خووری و ئورارتوودا نیشانەی - u بەکارهاتووە، وەک:
-ma- (a-) nu ئەو بوو.
- ad - u -(i) d - (ئەوان) خڕبوون.
بۆ دەربڕینی باری کاری تێپەڕ لە زمانی خووریدا شێوەی نێوی بکەرو کراو بەکارهاتووە، کە جێ نێوی کەسی لکاوی پێوە لکاوە، بەڵام لە زمانی ئورارتوودا شێوەی سەربەخۆی پۆلکردنی کاری تێنەپەڕ هەبووەو لە شێوەی نێوی بکەرو کراودا وەرگیراوە.
بکەری کاری تێنەپەڕ لە هەردوو زماندا بەم جۆرە داڕێژراوە:
خـــووری:

---

کەسی یەکەمی تاک dda < tta
کەسی یەکەمی کۆ /dilla -t
کەسی سێیەمی تاک ١- پنت. ٢- b-
کەسی سێیەمی کۆ e / lla-

ئورارتوو:

---

کەسی یەکەمی تاک dә
کەسی یەکەمی کۆ /ә di
کەسی سێیەمی تاک ١- پنت ٢-bә-
کەسی سێیەمی کۆ ١- / di ٢- lә
لە زمانی خووریدا لە تێنەپەڕدا a- بە o- گۆڕاوە، لە کاتێکدا، کە نیشانەی - kی ناکردنی پێوە لکاوە:

ئەو نايەت. ûn - o - k -o ئەو ديت. un - a
نيشــانەى كــۆ -o / du / it- لە دواى نيشــانەى تێــپــەڕو
تێنەپەڕدا هاتـووەو بۆ پێـشـاندانى باربووە وەك: - - pis̄ - is̄t
id (u/o) - in /e - n / دەبا ئەوان بێن.
(Speiser 1941, 1953. Diakonoff 1967, 1986, Nozagzi 1978, Khajikyan 1985).

# دارشتنی سینتاکسی

رستـه لە زمـانـی خـووریدا (تەنێ لە باری دەربڕینی گۆڕینی یاسـای وشـە لە نێـو رسـتـەدا نەبێت) بە بکەری بار دەستی پێکردووە، کە وشەی یارمەتیدەر، ئامرازی سەربەخۆ، یا ئاوەڵکار توانیویانە بە پێشی بکەون، هەروا دیارخەری بکەری رووداویش بۆی هەبووە بە پێشی بکەوێت.

بکەری رووداو کـەوتۆتە دوای بکەری بار، رسـتـە گـوزارەی هەبووە، دیارخەریش بە پێش نێوی دیارخراو کەوتووە.

زۆر بەکارهێنانی ئامرازی لکاو یەکێکە لە تایبەتێتیکانی رستە لە زمانی خووریدا، کە لەگەڵ هەموو رستەیەکی سەرەکی و هەموو جۆرە رستەیەکی شوێنکەوتوودا هاتووە.

لە کـاتی لێکدانی دوو کـار وەیا دوو نێـوی کـار بە بێ یارمـەتیـدانی ئامـراز، ئەوا وشـەی یەکـەمی ئەم وشـە لێکدراوانە وەکو ئاوەڵکاری وشەی دووەم تەماشاکراوە:

tiwe - na - Žen(a) - iff - us kad - u/oz -a- s̄s̄e - na ur -i- a -s̄s̄e - na.

شـتـەکـان برای من (کـە) باسکرا (کە)دە(یان) خوازێت.

دارشـتنی ئەم رسـتـەیە بە زمـانـی کـوردی بەم شـێـوەیەی ژێروو دەبێت:

برای من (برام) ئەو شـتـانە دەخـوازێت، کـە لەمـەو پێش باسی کردن.

ئەم رسـتـەیەی ژووروو لەگـەڵ رسـتـەکـانی ژێرەوودا نێـزیکـایەتی

هەیە، چ لە رووی شێوەی گەردان کردنی کارو چ لە رووی نێوی بکەرو کراو لەگەڵ ئامرازی لکاودا:

ḫaž̄ - ož̄ - af -(u)n pis - an - d - u -/ ož̄- i - tta(an).

من گوێم لێ بوو ئەوە، شاد بووم // من گوێم لەوە بوو، شاد بووم.

anz - an(n) - u/0ḫ - u/ož̄ - af kull -i - mān

من داوام کرد، قسەکەر // من داوام لە قسەکەر کرد.

ئەگەر لە دوو کاری گەردان کراودا تەنێ ئەوەی دووەم ئامرازی لکاوی (an -)ی پێوە لکاو بوو، ئەوە کاری دووەم ئەنجامی رووداوی کاری یەکەم دەردەبڕێت:

hijaruḫḫa - tta -n - u/on - ae z̄en(a) - iff - us keb - an - u /o - en.

زێڕ - من - هەیە - زۆر، برا - من - دەنێرێت - بزانم (ئاگاداربم) با. // با برام زێڕێکی زۆر بنێرێت، و با من ئاگاداربم.

ئەگەر هەردوو کار بە یارمەتی ئامرازی پێوەندی لێکدراو بن، ئەوە یەک لە دوای یەک هاتنیان تەواو و راستە وەیا هەردوو کارەکە هۆی پێوەندی رووداوەکە پێشان دەدەن:

mann u/o - kk - a- ll(a) -an andi - un - u/o kk - al (la) - an.

- ئەوان - و ئەوانە دێن - ئەوان - دەبێت // ئاوا دەبێت، کە ئەوانەی ئەوان دەیکەن.

ئامرازی نێوی وەیا پاشبەندەکەی - ai- یان - edi پێویستی بە دۆخی خستنەسەر بووە، هەر هەمان ئامرازی نێوی لەگەڵ نیشانەی

دۆخی مەبەست و ڕێچکەو شوێن دا پێویستییان بە دۆخی مەبەست بووە، کە ڕێڕەوی نێوی پێشان داوە:

Z̄en (a) - if - we - ne aie

لەپێش برای من دا.

en (e) - if - wa - ai - da

لەپێش خودای خۆم دا.

attai - aff (< attai - w - wa) edi - (j) -

لە پێوەندی باوکی تۆدا.

tiwe - wa - n edi -(i) - da - n

لەبەر قسە (وشە)ی تۆدا.

سینتاکسی ڕستە لە زمانی ئورارتوودا هێندێک جیاوازی لەگەڵ ڕستەدا لە زمانی خووریدا هەیە، لەو جیاوازییانە نەبوونی ئامرازی لکاو لە زمانی ئورارتوودا، هەروا کەمی ژمارەی سەربەخۆ.

تێکدانی ڕستە لە زمانی ئورارتوودا بە یارمەتی ئامراز بووە، ڕستەی شوێن کەوتوو بە یارمەتی ئامرازی گەیەنەری ale , ase , in داڕێژراوە (ئامرازی - al بۆی هەبووە تایبەتێتی جۆراوجۆری ڕستەی شوێن کەوتوو بنوێنێت). لەڕستەی شوێن کەوتوودا لە زمانی ئورارتوودا هەرگیز شێوەیەکی تایبەت و تەواوی کار نەدراوە، لە کاتی هەبوونی کاری تێپەڕ لەڕستەدا ئەوا بکەری ڕووداو هەمیشە بە پێش بکەری بار کەوتووەو دیارخەریش هەروەکو زمانی خووری بە شێوەیەکی گشتی لە پێش نێوی دیارخراوەوە بووە، کێشەی ڕێککەوتنی بەشەکانی ڕستە لە نێوان

خۆیاندا تا ئێستا لێیان نەکۆڵدراوەتەوە.
بکەری ڕووداوی کەسی سێیەمی کۆی کاری تێپەڕ وێکچووی کەسی سێیەمی تاک بووە، لە نێو نووسراوەکانی میهر قاپوو سوو و کێلەشین دا لە موساسیردا (Melikishvili 1953) و لەوانەیە تایبەتێتی دیالێکتی موساسیر بێت لە زمانی ئورارتوودا.

# بەندیواری زمانانی خووری
# و
# ئورارتوو بە زمانانی کەفکازێوە

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بیروڕای جۆراوجۆر لەبارەی زمانی خووری و ئورارتوودا دەربڕاوە، کە بوو بە هۆی لێدوان و لێکۆڵینەوە لە زۆر لایەنیدا، بۆ وێنە ف. بورگ هێژ لە ساڵی ۱۹۰۹دا بنج بڕانە ئەوەی خستەڕوو، کەوا زمانی خووری (ئەوسا بە نێوی میتانی نێودار بوو) زمانێکی کەفکازییەو بۆ ئەم مەبەستە وەکو بازنەیەک زمانانی سەر بە گروپی کەرتڤالی لەگەڵ زمانانی باکووری کەفکازدا لێکدا، کە زمانانی (ئەبخازی، ئەدیگسی، ناخی و داغستانی) دەگرێتەوە هەروا لە بواری وشەی فەرهەنگی و مۆرفۆلۆژیدا هەوڵی داوە خزمایەتێک لە نێوان زمانانی کەفکازی و زمانی خووری دا پەیدا بکات.

سەبارەت بە رەسەن لۆژی زمانی ئورارتوو و بە زۆری گەڕاندنەوەی بۆ سەر گروپی زمانانی کەفکازی لە نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە سەری هەڵداوەو تا ماوەیەکی درێژیش ئەم جۆرە بیرە هەر باوبووە، لە ساڵی ۱۹۲۱دا ف. مار لە وەرگێڕانی نووسراوی ساردووری دووەمدا هەوڵی داوە لەڕووی ئیتیمۆلۆژێوە بیگەڕێنێتەوە سەر زمانانی کەفکازی و بە تایبەتی گورجی، بەڵام بۆچوونەکانی شەقڵی وێست و ئارەزووی خۆی پێوە دیاربوو.

بەراوردکردنی رێزمانی لە نێوان زمانی ئورارتوو و زمانانی کەفکازیدا لە نێو بەرهەمەکانی ک. ڤ. چیریتیل و

مەلیکیشڤیلیدا ڕەنگی داوەتەوە.
(Melikishvili 1953, 1954)
کەفکازی ناسی پۆڵۆنی ر. براون لەگەڵ ک. ئا. کلیمۆڤدا لە ساڵی ١٩٥٤دا راپۆرتێکیان نووسی، کە تێیدا خزمایەتی نێوان زمانی ئورارتوو لەگەڵ کۆمەڵە زمانانی ناخیدا پێشان داوە، ئەگەرچی لە سەرەتای کارکردنیاندا نەگەڕابوونەوە سەر گریمانەکان، بەڵام ئم کارەیان هانی ی.م. دیاکۆنۆڤ و س.ئا.ستارۆستینی دا بۆ ئەوەی ئەم ڕێبازە بگرن و هەر لەم رادەیەش نەوەستن، بەڵکو بە زمانی خووریوەشی ببەستن، نێوبراوان لەم کارەیاندا باری مۆرفۆلۆژی هاوچەشن و نێزیکی، کە بەرچاویان کەوتوون خستویانەتە روو و بە تایبەتی لە نێوان زمانانی خووری-ئورارتوو و ناخیدا (چیمان-ئەنگوش وباجی) وەیا زمانانی لیزگینی (لیزگین، ئاگول، بودووخ، روتوول و چاخوور)و بە تایبەتی لە نێوان چین و ناخ و داغستاندا.
(Diakonoff & starostin 1986)
ک.ب. چاوکیان زمانی ئورارتووی بە زمانێکی خزمی زمانانی هیندو ئەورووپی کۆن سەیر کردووە، بەوەی ڕەگی ئەو وشانەی لە هەردوولادا چۆن یەکن لەڕووی ئیتیمۆلۆژیەوە خستۆتەڕوو ئەوەی شایەنی باسە نێوبراو هیچ نرخێکی وای نەداوەتە نێزیکایەتی نێوان هەردوو زمانی ئورارتوو و خووری لە مانەوە ئەوە روون دەبێتەوە، کەوا دەیان ساڵە قوتابخانەیەک سەری هەڵداوە بۆ ئەوەی زمانانی جۆراوجۆری کەفکازی بەرێتەوە سەر زمانانی خووری و ئورارتوو، ئەوەی لە نێو زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی ئەم

قوتابخانەیەدا سەرنج راکێشە ئەوەیە کەوا بیرورِایەکی یەکگرتوو نیە، لەبارەی گێرِاندنەوەی چ زمانێکی کەفکازی بۆ سەر زمانی خووری و ئورارتوو، هۆی ئەم جیاوازیەش بۆ مەڵبەندی نیشتەجێی بنجی خووریان دەگەرێتەوە، کە کەفکاز نەبووەو بەڵکو چیایەکانی کوردستان بووە، ئەو چیایانەی، کە لە سەردەمی مادە وە بە چیاکانی زاگرۆس نێودار بووە، سپایزەر راستی بۆ چووە، کە ئەم زمانەی بە زمانێکی زاگرۆسی لە خامە داوە نەک بە کەفکازی.

هەبوونی چەند وشەیەکی هاوبەش وەیا لێکچوو لە نێوان زمانی ئەرمەنی و زمانی ئورارتوودا وای لە هێندێک ئەرمەن ناسان کردووە، کەوا بەندیوارێک لە نێوانیاندا پەیدا بکەن و لەو وشانەی، کە بە وێنە هێندراونەتەوە ئەمانەن:

ئورارتوو- Šure چەک، ئەرمەنی- Sur شیر.

ئورارتوو- Ṣari باخ، ئەرمەنی- Çar دارودرەخت.

ئورارتوو- Ultu وشتر، ئەرمەنی- Ult وشتر.

خووری و ئورارتوو- Ewri پاشا، سەرۆک.

ئەرمەنی- awri- ord کورِ بە واتا پیاوی بێ ژن.

کار هەر لەسەر زمانی ئەرمەنی نەوەستاوە، بەڵکو هێندێک لە گورجی ناسان بە هەبوونی یەک دوو وشەیەکی لێکچوو لە نێوان زمانی گورجی و ئورارتوودا هەوڵیان داوە زمانی گورجی ببەنەوە سەر زمانی ئورارتوو، بە تایبەتی بە هەبوونی چەند وشەیەکی ئورارتوو لە نێو زمانی گورجیدا کە ئەمانە هێندێکن لەوان:

Ewri Arale .., tarae Arale .., ari Arale

پاشای ئەرالی ...، توانای ئەرالی ...، بدە ئەرالی.
هەبوونی وشەی هاوبەش لە نێوان زمانی ئورارتوو و زمانی ئەرمەنیدا کارێکی ئاساییە، چونکە بە رێگەی نووسراوانی مێخی نێوان (١٨٠٠-١٥٠٠ پ.ز.)دا ئەوە روون بۆتەوە، کەوا ئەرمەنستان بەشێک بووە لە وڵاتی نایری (نائیری-زاراوەیەکی ئاشووریە بۆ نێونانی ئەو هەرێمانەیان بەکارهێناوە، کە کەوتبوونە ژووروروی خۆیانەوە، لە نێوان سەرچاوەی هەردوو رووباری دیجلەو فورات) چەند کۆمەڵێکی خووری زمانیشی تێدا نیشتەجێ بووە، بۆیە ئەو زمانەی ئەوسا لە ئەرمەنستاندا بڵاو ببۆوەو قسەی پێکراوە لە زمانی خوورێوە وشەیەکی زۆری وەرگرتووەو هەروا بە پێچەوانەش.
پاشای ئورارتوو-ساردووری یەکەم (دەوروبەری ٨٣٢-٨٢٥ پ.ز.) ئەوەی تۆمار کردووە، کە پاشای نائیری بووەو لەسەر بەردێکی ئەو شوورەیەی، کە لەسەردەمیدا بیناکراوە بە زمانی بابلی نووسیویەتی و دەڵێت: (پاشای مەزن، پاشای بەهێز، پاشای جیهان، پاشای وڵاتی نایری و..).
خووری لۆژان وای بۆ دەچن، کەوا خوورییان تا سەدەی V-VI پ.ز.دا و بگرە درەنگتریش لە بەرزاییەکانی ئەرمەنستاندا هەر مابنەوە و نەک هەر ئەوان بەڵکو کۆمەڵانی جۆراوجۆری دیشیان تێدا بووە، چونکە هیرۆدۆت لە پاڵ نێوبردنی ئەرمەندا نێوی ساسپیرو ئالارود و ماتیەنیش بردووە.
وا دیارە ساسپیر وەکو زمانی هۆزانی کارتڤیلی بووبێت، ئالارودیش ئورارتوو و ماتیەنیش هەر دەبێت خووری بن و لەگەڵ

نێوی میتانیدا بەراوردی بکە.

بە پێی ئەو لێکچوواندنەی ئەرمەن ناس و کەفکازی ناسان کردوویانە، گەر ئێمەی کوردیش بەراوردێک لە نێوان چەند وشەیەکی هەمان وشە لێکچووەکانی واندا بکەین دەبینین وشەی (شوور//شۆڕ)ی زمانی کوردی کە لەگەڵ (وشەی شەڕ)دا دێت و لە شێوەی (شەڕوشووڕ) دادەڕێژرێت زۆر لە šureی ئورارتوو نێزیکە چ لەڕووی گۆکردن و چ لەڕووی واتای کە چەکە، هەرواش لەگەڵ وشەی ṣari ئورارتوو، کە واتای باخی گەیاندووە، ئەمڕۆ لە کوردیدا بە دارستانێکی پڕ لە دارو درەخت دەڵێن چڕ.

لەو وشانەش، کە بۆ دۆزینەوەی خزمایەتێکی زمانەوانی لە نێوان زمانانی خووری و ئورارتووداو زمانانی کەفکازی- بەری رۆژهەلاتی وشەی -ساڵ-ە،، کە لە خووریدا sawal، لە ئورارتوودا šalə بووە، لە زمانانی کەفکازی دایک - بەری رۆژهەلاتی swyrho، لەزگین swr، ئەواریان asra-ja-b، ئاخواخ asara-so-b، ئاگول is، ئەبخاز šwə یە.

وشەی (سال// ساڵ)ی زمانی کوردی و زمانانی دی ئێرانیدا زۆر لە وشەی sawal ی خووری نێزیکترە، تا ئەو وێنانەی کە لەزمانانی بەری رۆژهەلاتی کەفکازیدا هێنراونەتەوە.

وێنەیەکی دی لەم وشە لێکچووانە خووری و ئورارتوو šijv، خووری sijə- رووبار، ئاو، شیو، لە زمانی کەفکازی دایکدا -a sv، روتوول a-s s-xa تەڕبوون، جاخوور al-ex-as توانەوە، ئاگوول d-ix-ef پالاوتن، ئاوارییان is-ize بپاڵدریۆت، ناخی čeč-il یە، کەچی لە زمانی کوردیدا بەرامبەر بە šijv ی

خووری و ئورارتوودا، کە واتای ئاو یا رووبار دەبەخشێت وشەی شیو هەیە، کە واتای جۆگەڵە ئاو دەگەیەنێت، هەروا وشەی شێ بۆ تەڕایی نێو هەوا بەکار دێت.

# هێندێک لایەنی لێکچوو
# لە نێوان زمانانی
# خووری، ئورارتوو و کوردی دا

ئەو نیشانانەی، کە بە هۆیانەوە دۆخ لە زمانی خووری و ئورارتوودا دارێژراوە هێندێکیان لەڕووی ئەرکەوە هەمان دەوری ڕێزمانی لە زمانی کوردیدا دەگێڕن، هەڵبەت لەگەڵ گۆڕینی فۆنۆتیکی، یا سووک بوونەوەی نیشانەکاندا لەوانە: (a)šteی خووری و ašto ی ئورارتوو، کە لە دۆخی گواستنەوەدا بەکارهاتووە، هەروا نیشانەی asə بۆ تاک و as بۆ کۆ لە زمانی ئورارتوودا بۆ دارشتنی دۆخی شوێنی سەرهەڵدان بەکارهێنراوە، ئەمرۆ لە زمانی کوردیدا ئامرازی (ژ)، کە لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستاندا لەگەڵ دوو دەنگی (ک)و(ت)دا وەکو (ش) گۆ دەکرێت و شوێن و کاتی سەرهەڵدانی ڕووداو پیشان دەدات، هەروەکو جۆری بەکارهاتنی لە زمانی خووری و ئورارتوودا:

ئازاد ژ چیێ هاتە خارێ // ئازاد لە چیا هاتە خوار(ێ).

ئەوەی شایەنی باسە هێندێک لە زمانەوانان ئامرازی (ژ) بۆ (haca)ی ئێرانی کۆن دەگەڕێننەوە لەوانە پرۆفیسۆر کوردۆیێف (کوردۆیێف -١٩٨٤).

ta< da نیشانەی دۆخی گواستنەوە بووە لە زمانی خووریدا، لە زمانی ئەمرۆی کوردیدا da- پاشبەندی بە واتا پاشکۆی ئامرازی ئامرازی پێوەندی (بە،لە)یە، ئەرکی ئەم پاشکۆیە بەپێی ئەو ئامرازە دەگۆڕێت، کە لەگەڵیدا هاتووە:

به شاری هەولێردا تێپەڕیم.
لەبەر ڕووناکی چرادا دەدرەوشایەوە.
لە دوای ڕوودانی ئەم کارەساتە جەرگ بڕەدا هەرچی ڕوودەدات، با ڕووبدات.

-ta-n < - da-n نیشانەی دۆخی سەرچاوە بووە لە زمانی خووریدا، لە زمانی کوردیدا dan- پاشگرێکە شوێن سەرچاوەی شت پێشان دەدات لە کاتێکدا، کە بە نێوەوە دەلکێت، وەک: ئاگردان، کادان، گوڵدان و هی دی.

ka(i) -n لە زمانی ئورارتوودا نیشانەی دۆخی سەرهەڵدانی داهاتوو بووە لەباری کۆدا، لە زۆربەی شێوەزارەکانی سۆرانی و موکریدا keynê جێ نێوی پرسیارە: کەینێ بێمە دووت؟ کەینێ ڕووی دا؟

a, ia نیشانەی دۆخی شوێن بووە بۆ تاک لە زمانی خووریدا، بەڵام لە زمانی ئورارتوودا a- بۆ تاک و بۆ کۆ بەکارهاتووە. لە زمانی کوردیدا پاشکۆی ئامرازی پێوەندی (لە)، کە da-یە واتای شوێن دەبەخشێت، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم پاشکۆیە لە شێوەی a-دا بەکار دێت بە هەمان مەبەستی da- کە دوور نیە هەر هەمان a- ی خووری بێت، کە زۆربش وا پێ دەچێت کورتکراوەی da- بێت.

نیشانەی ئاوەڵنێوی ḫa ([illegible]), -h (-[illegible]) لە هەردوو زمانی خووری و ئورارتوودا تایبەتێتی ئیتنیکی و جوگرافی پێشان داوە، هەروا لەگەڵ ئەو وشانەشدا بەکارهاتوون، کە ئاوەڵنێو بوون و بە خزمایەتی بۆ باوک گەڕاونەتەوە، لە زمانی

کوردیدا نیشانەی ئاوەڵنێوی -ki- لەگەڵ ئاوەڵنێوێک بەکار بێن پلەی باڵای پێشان دەدەن و لە کاتێکیشدا کە ئاوەڵنێوەکە دووپات دەبێتەوە ئەم نیشانەیە بە کۆتایی دووەمەوە دەلکێت هەروەک: قول، قولکی، سۆر سۆرکی، رەش - رەشکی تال- تالکی.. (کوردۆیێڤ - ١٩٨٤).

نیشانەی ئاوەڵنێوی u/oḫḫe-aḫḫe ی خووری و û/oha< - u/ oḫa ی ئورارتوو لەگەڵ ئەو ئاوەڵنێوانە بەکارهاتوون، کە واتای کەرەستە یا چۆنیەتییان بەخشیوە.

لە زمانی کوردیدا پاشگری - okî دەچێتە سەر ئاوەڵنێوی چۆنیەتی و ئاوەڵنێوێک لە پلەی باڵادا دادەرێژێت: کرێژۆکی، زەرکۆک (ی)، رەشکۆک (ی)، تال - تالۆکی.. هەروا بە کۆتایی رەگی کارەوە لکاوەو ئاوەڵنێوی لێ دارشتووە: گەرۆک (ی)، زەلقۆکی زەرقۆکی.. (کوردۆیێڤ - ١٩٨٤).

نیشانەی nne(i) ی خووری ئاوەڵنێوی نسبی دارشتووەو بە کۆتایی هەموو جۆرە نێوێکەوە لکاوە، لە زمانی کوردیدا پاشگری- ini ی دەچێتە سەر کۆتایی نێوو نێوی ئەبستراکتی لێ دادەرێژێت، وەک: شیر-شیرینی، زیو زیوینی..

لە زمانی ئورارتوودا ئەم نیشانەیەی خووری لە شێوەی anne یا unna ش بەرچاو کەوتووەو ئاوەڵنێوی نسبییان دارشتووە، لە زمانی کوردیدا پاشگری -ani دەچێتە سەر نێوو ئاوەڵنێووی نسبی دادەرێژێت: ژن-ژنانی، کچ-کچانی، پیاو-پیاوانی..

لە زمانی ئورارتوودا تیپی سەربەخۆ هەبووە بۆ ناکردن، کە برێتی بووە لە mi و کەوتۆتە پێش کارەوە. لە زمانی کوردیدا- me

نیشانەی ناکردنەو ئەویش دەکەوێتە پێش کارو داخوازی ناکردنی کارێک دەکات: مەکە، مەڵێ و.. لە زمانی فارسیشدا هەمان نیشانەی کوردی لە هەمان باری رێزمانیدا نیشانەی ناکردنە: مکن، مگو و..

لە زمانی خووریدا کاری تێنەپەڕ لە شێوەی نێوی بکەرو نێوی کراودا جودا نەکراونەتەوە، بۆیە گەردان نەکراوە، نیشانەی تێنەپەڕ لە زمانی خووریدا o/u و لە زمانی ئورارتووشدا a وەیا o/u بووە.

نێوی بکەر لە زمانی کوردیدا بە یارمەتی u- دادەرێژرێت و نێوی کاریش بە یارمەتی e - : خەوتوو، زیندوو..، کردە، بردە.. هەروەک لەم گۆتەدا بەکارهاتووە: (کردەی من و بردەی ئەو).

| وشەی خووری: | وشەی کوردی: |
| --- | --- |
| alg- ئەلقە | ئەلقە |
| amurt- مۆرت | مۆرت |
| ard- ئەرد | ئەرد، زەوی |
| ars- گەنج، لاو | هەرزەکار |
| asi- دیل | یەخسیر، دیل |
| ašti- ژن | ئەستی// ستی - نێوی تایبەتی ژنانە |
| awari/e- هەوار، کێلگە | هەوار، ئاقار، ئاوایی |
| bawr- بۆر | بۆر، قاوەیی |
| burg- بورگ | بورگ. بورج |
| dada- دایە، دادە | دایک، دایە، دادە |
| es- ئەسپ | ئەسپ |
| kew- دانان | کەو-رەگی کەوتن |
| kul- بەجێ هێشتن، کۆڵ دان | کۆڵ دان، بەجێ هێشتن |
| kur/o- کەرەتێکی دی | کەرەت |
| mann- مان، هەبوون | مان |
| mari- مێر | مێر، مرۆ |

| | |
|---|---|
| mariani- مێرێنی | مێرتی، پیاوەتی |
| nas- ناز | ناز |
| nih- بەهرە | نیگار(کاری) |
| paba- کێو، چیا | پۆپە، پۆپ // لوتکە |
| pil- کەنال | پرد |
| qult- لێژ | کوێر، قۆرت |
| šeja- ڕووبار، ئاو | شێ، تەڕایی |
| šir- شیرین بێت، چاک بێت | ژیر، هۆشمەند |
| šukkuo- چونکە، جا | چونکە، چونکو |
| tad-ar-az-k-a-e- خۆشەویستانە | تەدارەک |
| Tiš(š)-نازناوی خوداوەندی مانگ (؟) | تیشک، تیژ |
| tiššan- تژی، زۆر | تژی، پڕ |
| ḫur- دەنگی ئاو | خورە خوڕی ئاو |
| ḫalu/o- حەلوا | حەلوا ،هەلوا |

| وشەی ئورارتوو: | وشەی کوردی: |
| --- | --- |
| ئەلقە -alg-a | ئەلقە |
| مۆرت -amurd-inne | مۆرت |
| ئەرد ، زەوی -ardi-ne | ئەرد ، زەوی |
| گەنج، لاو -arse | هەرزەکار |
| دیل -asi | یەخسیر، دیل |
| بەرئاوەڵەیی -awara | ئاوارە |
| بۆر -bawr | بۆر |
| ئورارتوو -Bia-in | بیانی // بێگانە |
| بورگ -borg | بورگ ، بورج |
| دایک، دادە -dada | دایک، دادە |
| ئەسپ -ese | ئەسپ |
| ئەوێ، کوێ -ew | ئەوێ |
| کۆڵ دان، جێ هێشتن -kul | کۆڵ دان |
| مێر -mare | مێر، مرۆ(ف) |
| مێرینی -mari | پیاوەتی، مێرینی |
| ناز -nas | ناز |
| بەهرە -nih | نیگار(کردن) |
| کەنال -pile | پر(د) |
| لێژ -qult | کویر، قۆرت |
| ساڵ -sala | ساڵ |
| چەپ -saphale | چەپ |

| | |
|---|---|
| ṣari -باخ | چڕ، دارستانی چڕ |
| šure -چەک | شەڕوشووڕ |
| ẖur -دەنگی ئاو | خورە خوڕی ئاو |

لەگەڵ هەبوونی ئەو بەندیوارییەی ژووروو لە نێوان زمانی کوردی و زمانانی خووری و ئورارتوودا، ناتوانم بڵێم زمانی کوردی بۆ زمانانی خووری و ئورارتوو دەگەڕێتەوە، چونکە زمانی کوردی لەڕووی بناخەی لێکسیککۆلۆژی و دارشتنی ڕێزمانیەوەی زمانێکە سەر بە کۆمەڵە زمانی باکووری ڕۆژئاوای زمانانی ئێرانی، کە ئەویش گروپێکە لە خێزانی زمانانی هیندو ئەوروپی، بەڵام کاریگەرێتی زمانانی خووری و ئورارتوو بۆ سەر زمانی کوردی سەردەمی کۆن هەبووە.

## ئـــەنـجـــام:

لە شـوێنەواری نووسـراوی خـوورییـان و ئورارتوویاندا، کـە لە خاکی کوردستاندا دۆزراوەتەوە، وەک نووزی-هەرێمی کەرکووک، ئورکـیش -سـەرچاوەی رووباری خـابوور، نەوار-بەری رۆژهەڵاتی دجلە، سیروان، تل حلف-هەرێمی سێ کوچکەی نێوان عـێراق و ئێـران و تورکـیـاو دۆڵـی رووباری بۆتان، بەرزایەکـانی سـاسـۆن، دۆڵی رووباری ئاوەڕەش/قەرەسوو، لە سەرووی رووباری فورات، باشووری گـۆمی ورمێ، شـمـشـارە لە دەشـتی بـتـوێن، ئەوە روون دەبێـتـەوە کـەوا بە شـێـوەیەکی گـشـتی زمـانی نووسین و زمـانی قسەکردنی دانیشتوانی کوردستان لە هەزارەی سێی پێش زایینـدا، تا نـێـوەڕاسـتی هەزارەی یەکی پێش زایین زمـانانـی خـووری و ئورارتوو بووە.

زمـانـی خـووری تا مـاوەیەک زمـانی دەوڵەتی دەسـەڵاتدارێتی میـتـانیانیش بووە، هەروەکو لە نامەکانی تووشراتە را دیارە، کە بۆ ئامون حوتوبی سێـیەمی ناردووە، چونکە زمانی خووری زمانی پیرۆزی ئەو هەرێمـانە بووە، کە میـتـانێکان فـەرمـان رەوایەتییـان تێدا کـردووە، هەڵبـەت لە دووایـیدا بەرە بەرە زمـانی خۆشـیـان لە نووسیندا بەکارهێناوە.

زمـانی خـووری چەندە کـاریگـەری لەسـەر زمـانانی ئەو ناوچانەدا هەبووە، کـە فـەرمـانڕەوایەتی تـێـدا کـردووە ئەوەندەش کـاریگـەری لەسـەر زمـانی میـتـانیـدا هەبووە، ئەو زمـانە میـتـانیـیەی، کـە بە زمانی پرۆتۆ کوردی دەژمێردرێت.

لەبەر رۆشنایی پاشماوەی نووسراوی خوورییان، کە تا ئێستە دۆزراونەتەوە ئەوە روون دەبێتەوە، کەوا خوورییان لەگەڵ داهاتنی چەرخی مێژوودا خاوەنی راستەقینەی ناوچەکانی باشوورو نێوەڕاستی کوردستان بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی لەوساوەی شوێنەواری نووسراوی خوورییان دۆزراوەتەوە، کوردستان دابەش کراوەتە سەر چەندین دەوڵەت، بۆیە چۆن کورد لە مافی رەوای یەکبوون و بێ دەسەڵاتداریتی لەسەر خاکی خۆی بێ بەش کراوە، ئاواش لە خێویتی کولتووری دەوڵەمەندی خوورییان بێ بەشی بووە.

## تێکستێک به زمانی خووری کۆن

## نووسراوێکی تیشاری – پاشای ئورکیش سەدەی ٢٣ – ٢١ پ . ز :–

Tiṡ(ṡ)-ar-i/e[1] , enda-n[2] UR.KÈŠ[ki] (-we)[3] ; purli[4]

[d]PIRIG . GAL (-we)[d] pah - (a)št-u-m[5] pur (u)li

addi[6] , halli[7] Lubadaga - ṡš/žagr-u-in[8] ; (j)e - me

- ni(n)[9] tašp-i[10] , halli[11] Lubadaga-š tašp-u-in[12] ,

AN (-ṡ) ḫaw - uḫ ( ? ) - a[13] ḫaž - u - we - in[14]

[d]NIN . NA . GAR[ki] (-š) Šimig(e) - an Teṡšob(-aṡ)

, (j)e-me - ni(n) tašp-i[15] , halli inobe - inobe[16]

š/že - (i) d (o) - in[17] . ( دیاکۆنۆف ـ ١٩٦٧ )

# واتای تێکستەکە بە زمانی کوردی

تیشاری(١) پاشای(٢) ئورکیش(٣) پەرستگەی نێرگالی(٤) بیناکرد(٥)، ئەم پەرستگەیە(٦) ک(٧) لوباگادا با (بریا) بیپارێزێت(٨) ئەمەی کە لە ڕاستیدا(٩) دەیڕوخێنێت(١٠). ئەوە(١١) لوباگادا با (بریا) لە نێوی بەرێت(١٢) (خوداوەندانی) ئان نزای(١٣) با بەجێ نەهێنێت(١٤). (خوداوەندان) نین. نا. گار (ژ)شیمیگان(١٥) تیشوب دەبا دە هەزار جار دە هەزار جار (؟)(١٦) نەفرەتی لێ بکەن(١٧).

تێبینی:

١- نێوی تایبەتییە، رستەیە، ar-i/e- کاری فەرمانە - بدە، Tiš(š)- نازناوی خوداوەندی مانگە(؟) - Tiss-ari نیهادی رستە

Tišš-ari endan UR.KEŠ[ki]-

تیشاری (هەیە) پاشای ئورکیش.

٢- وشەی enda بە پێی ئەو تێکستەی بەردەست واتای-ئەو پاشای ئورکیش (هەیە) دەگەیەنێت، بەڵام لە نێو تێکستانی دیدا بەرچاو نەکەوتووە.

٣- لەگەڵ تێبینی ژمارە (١)دا بەراوردی بکە.

٤- واتای پڕ بە پڕی purli (خانوو/خانی) دەگەیەنێت.

٥- pah- رەگی کارە، نیشانەی (a) لە زمانی کۆنی ئەکەدیدا بۆ دەربڕینی ha,ha بەکارهاتووە.

٦- addi لە زمانی خووری کۆنتردا andi بووە.

٧- وشەی halli ی خووری لەگەڵ ata ی ئورارتوودا بەراورد بکە، کە واتای (ئە ئەوە، ئەوەی کە، کە)ی بەخشیوەو هێندێک لە خووری لۆژان وای بۆ دەچن، کەوا جێ ناوی نیشانەی anni ی هەر addi-ḫe - alli بێت، کە مانای ئەوە - هەتا دەبەخشێت، کە مەبەستی لە ئەم (خوداوەندە) هەتا (پەرستگە)یە یە.

٨- دەتواندرێت کاری šagr-u-in وا روون بکرێتەوە، کەوا لە شێوەی کاری فەرمانە بۆ کەسی سێیەمی تاک.

١٠- وا دیارە کرداری کارا بزری کارێکی تێپەڕە.
١١- واتای پڕ بە پڕی (ئەوەی کە)یە.
١٢- لە رووی دارشتنەوە لەگەڵ تێبینی ژمارە (٧)دا بەراوردی بکە.
١٣- -a- جێ ناوی هەیی کەسی سێیەمی تاکەو لە کۆنتردا لە شێوەی a(j)-دا بووە، دوور نییە تیپی w و u هەر o بووبێت، لەگەڵ پاشگری u/ohhe-دا بەراوردی بکە.
١٤- جۆری ناکراوی šagr-u-in,tašp-u-in دانانی هاوتەریب بووە، -u- لە (کۆنتردا -i-) نیشانەی تێپەڕ بووە، -w(a) نیشانەی ناکردن و i/e- نیشانەی کەسی و (e)- نیشانەی بەرکاری بوون.
١٥- لێرەدا an- ئامرازی پێوەندییەو ئەگەرچی لە زمای کۆنتری خووریدا بە کۆتایی ناوی Teššob ەوە لکاوە.
١٦- i-na-u-be//i-nu-be لە ڕووی گۆکردنەوە inobe بووە.
١٧- لە باری کۆی هەما شێوەی ئەم دو وشەیە šagr-u-inة و tašp-u--in دایە، (i)d(o)- نیشانەی کۆیە -ido-in>din لەگەڵ tina- ی ئورارتوودا، کە فەرمانەو لەباری کۆ دایە بەراوردی بکە.

له نامەکانی نوسراتای پاشای میتانی، کە بۆ ئامون حوتوبی سێیەمی فرعەونی میسر ناردبووی و بۆ دەوروبەری ۱٤۰۰ ساڵ پ . ز . دەگەڕێتەوە:

[ ... žen(a)-iff(u)-da[1] - ma-an[2] tiwe šukko[3]

kul(-i)l-e[4] zen(a)-iff-ušš[5] -an[6] haž-i-en[7] žen

(a)-iff-we-n[11] , att(a)-ardi-iff(u)[10] -ta-n[8] Mane-[12]

-an[9] zen(a)-iff-we[13] pašš-id-ɣ/he un-a[14] , inna-

ma-nin[15] niɣari ag-ož-af[16] ...žen(a)-iff-uš[5] mag-

ann-iff-[19] -an(?)[17] keb-an-ož-a[20] -šše[18] , inna-ma-

nin Mane-š[21] ag -i-en(?) pugl-ož-af[22] -n-an... ija-

lle-nin[25] žen(a)iff-uš[26] tube -na[24] -ma-na[23] šu(w)a-

lla-ma-an[23] keb-an-ož-a-šše-na[27] ... ai-ma-nin žen-

(a)-iff-uš(?) mag-an-iff-(n)na[28] keb-an-ed-a[29] ,

and(i)-wa-tta-an[30] te-on-ae[32] tiššan tiššan pis-ož-

t-ewa[33] tiž-iff-a-[34] -an[31] mana šu(w)e-ne[36]

anamm(i)-lla[37] -an[35] undu žen(a)iff(a)-da[1] kul-ož-

af pali ...] . ( دیاکۆنۆڤ ـ ۱۹٦۷ )

## واتای نامەکەی توشراتا-پاشای میتانی بە زمانی کوردی:

[ .. جا(٢) برام(١) لە دوایيدا وتەی (خۆم)(٣) با من ببێژم(٤) بەڵێ(٦) با برام(٥) گوێی لێ رابگرێت(٧) کەواتە(٩) بەبۆنەی(٨) مارەیی(١٠) (لە) برامەوە(١١) مانە- ئەو(١٢) نێراوەی برام(١٣) گەیشت(١٤) و بەڕاستی(١٥) جەهاز من ناردم(١٦) ... بەڵام(١٧) (لەبارەی) ئەوەی (بەوبۆنەیەی)(٨)) برام (ئەو)(٥) دیاری(یەی) بۆ من (١٩) نارد(٢٠)، کە لەڕاستیدا مانە(٢١) من ڕا(م)سپاردبوو(؟).. جا هەروا (دیسان)(٢٣) ئەو(انەی)(٢٥) نامانەی، کە هەموو لە ڕاستیدا(٢٥) برام(٢٦) ناردنی(٢٧) ...[لەبەرئەوەی لەڕاستیدا برام (؟)] (ئەو) دیاری(یانەی)بۆ من(٢٨) دەنێرێت(٢٩)، ئەوە (؟) لەبەرئەوە من(٣٠) ژی(٣١) زۆر(٣٢) زۆر شاد دەبم(٣٣) لە کانگەی دڵمەوە(٣٤) هەروا(٣٥) ئەوا هەموو بەم جۆرە(٣٧) ئیدی برام من راستیم دەربڕی ...].

تێبینی:

١- پێوەندی بە (بۆ برای من//برام)دا هەیەو تایبەتە بەوەوەو نیشانەی ڕێچکەیە، دەتواندرێت بەم جۆرەش بخوێندرێتەوە:Zenivda وەیا Zeniffud , ž̄enifta
٢- ma-an- جا، لەدوای ئەمەدا.
٣- šukko ئاوەڵکارە.
٤- دەمکاتی داخوازییە بۆ کەسی یەکەمی تاک.
٥- نیشانەی دۆخی بزرە -(u)š̄(s̄)-.
٦- - an.
٧- لەگەڵ ئۆبێکتی کەسی سێیەمی تاک: i/e-en لە دەمکاتی فەرمان کردنیشدا بەکارهاتووە.
٨- دۆخی دانان t/da-n- ی دەربڕیوە.
٩- لە لێکدانی an- لەگەڵ Mane - n -an دا.
١٠- واتای تەواو و پڕبەپڕی (دیاری باوک)ەو نێرراو واتای تەواوی - دیاری باوک - ە بۆ (بووک)، نێرراوی (من) دەیبەخشێت.
١١- ž̄en(a)-if/v - we لەگەڵ کۆتایی کەسی n-دا لەدۆخی خستنەسەردا بووەو بۆ (نێرراوی من) دەگەڕێتەوە.
١٢- Mane یەو (n-) کۆتایی کەسییە.
١٣- دۆخی خستنەسەرە.
١٤- گوزارەیەو کارەکەی تێنەپەڕەو کەسی سێیەمی تاکە.
١٥- inna ئەوەتا ma- جا nin- لەڕاستیدا.

١٦- af/v- کەسی یەکەمی تاکە لە دەمکاتی تەواودا.
١٧- an- ئامـرازی لێکدەرەو کـەوتـۆتە کـۆتـایی - - mag aan- iff [an (?)]
١٨- تایبەتێتی رستەی دیارخەری پێوەیەو بە یارمەتی ئامرازی ŝse کە لەگەڵ کار هاتووە داڕێژراوە.
١٩- لێرەدا واتای پڕپەڕی (دیاری من)ە.
٢٠- کاری تێپەڕی کەسی سێیەمی تاکە.
٢١- Mane بەرکـاری کـاری (pugl-oẑ-af) هـەروا بکەری کاری تێپەڕی ag-i یە.
٢٢- af/v- کەسی یەکەمی کاری تەواوەو لەگەڵ کاری تێپەڕی پێشـتر ag-oẑ-af/v دا بەراوردی بکە، کە بەرکاریشی لەگەڵدا هاتووە، کە بۆ کەسی سێیەم دەگەڕێتەوە.
٢٣- -ma-an جـارێکی دی، دیسـانەوە، بەڵام لەگـەڵ ŝu(w)a-llaā واتای (هەموو هی وان)ی بەخشیوە.
٢٤- tupe (جـۆرێکی دی tuppe)یە واتاکـەی تابلۆی قوڕینەو نیشانەی ناسراوو کۆی an- ی پێوە لکاوە.
٢٥- ija- (ئەوانەی)کە، lle- هی وان، nin- لە ڕاسـتـیـدا جێ ناوەو لە ئورارتووشدا بۆ هەمان ئەرک بەکار هاتووە.
٢٦- نیهادەو لە دۆخی بزر دایە.
٢٧- شـێـوەی کـارەو بە یارمـەتی نیـشـانەی -sse- دەربڕاوەو هەروا نیشانەی ناسراوو کۆی an-یشی لەگەڵدا هاتووە بۆ وشەی tube-na دەگەڕێتەوە.
٢٨- لە باری کۆو ناسراوی دایە، چونکە بە یارمەتی نیشانەی

na- ی ناسیاری و کۆ دارێژراوە، هەروا نیشانەی کۆتایی کەسی n- بە پێش نیشانەی پێشوو کەوتووە.

٢٩- کەسی سێیەمە بۆ دەمکاتی ناتەواو، نیشانەی -an- لەگەڵ کاری تێپەڕدا هاتووەو لێرەدا -t- ی کارە کە لە نێوچووە.

٣٠- tta- جێ ناوی لکاوەو بەجێ ناوی andi لکاوەو لە دۆخی مەبەست دان (وا دیارە wa- لە باری ئاوەڵکاری دایە؟)و نیهادی کاری تێنەپەڕەو ئامرازی an- ی لێکدەریشی لەگەڵدا هاتووە.

٣١- an- کەوتۆتە کۆتایی رستەوە.

٣٢- لە -te + بناخەی (بەهێزکردن و زیادکردن) -on + کۆتایی ئاوەڵکاری ae- پێکهاتووە.

٣٣- کەسی یەکەمە بۆ دەمکاتی تەواوی کاری تێنەپەڕ.

٣٤- a- نیشانەی شوێنەو نیشانەی an- ی لە نێوبردووە.

٣٥- an- لە anammillan دا ئامرازە.

٣٦- šu(w)e- هەموو: نیهادەو لەگەڵ نێوی دیارخراوی -mana ئەوە(١)دا بە یارمەتی نیشانەی دیارخراوی ne- دا لێکدراون.

٣٧- واتای تەواوی anammil-lla-an بەم جۆرەیە: (هی)وان - جا، هەر لە کوێدا -lla- (هی)وان هەبوو، هەمیشە بۆ هەموو دەگەڕێتەوە (هەموو وەکو وشەیەکی کۆ سەیر دەکرێت).

## تێکستێک بە زمانی ئوارتوو

لە نووسراوەکانی پاشا - رووسای دووەم کوڕی ئەرگیشی، کە بۆ سەدەی (٧)ی پێش زایین دەگەڕێتەوە:

$^{d}$Ḫal-di-e[1] EN-ŠÚ[2] i-ne $^{NA}$pu-lu-še $^{m}$Ar-giš-te-ḫi-

né-še[4] ku-ju-ne $^{d}$Ḫal-di-né-né[5] uš-ma-ši-né[6] $^{m}$Ru-

sa-a-še $^{m}$Ar-giš-te-ḫi-né-še- a-le $^{KUR}$Ḳu-ub-li-né

hu-bE-i[7] ḳi-ú-ra-a-ne šú-le-e ma-nu[8] ú-i jė-e-i[9]

iš-ti-né ma-nu-r[e][10] š[ú]-ki[11] $^{d}$Ḫal-di-še[12] ú-bar-

du-du-né[1] i-e-še- i-né $^{GIŠ}$ul-de-e[t]e-ru-be[14] ....

URU[15] šú-ḫe[16] iš-ti-né-šá-tú-ú-ú-le[17] pi-le $^{ID}$IL-

da-ru-ni-a-né[18] a-gu-ú-bé[19]... i-nu-ka-ḫi-ni-e[21,22]

$^{m}$RU-sa-i-ni-e[21,23] ḫu-bi-jė[21] a-še[20] pi-le-ni-ke-du-

le[24] UDU.MÁŠ.TUR $^{d}$Ḫal-di-e ni-ip-se-du-le-

ne[25]... a-še A[meš] e-ši-a[26] si-u-le[27] MAŠ.TUR
[d]Ḫal-di-e ni-ip-se-du-le...[m]Ru-sa-a-né[28] [m]Ar-gis-te-
ḫe-e LUGÁL DAN.NU[29] LUGÁL al-su-i-né[30]
ILUGAL-ne [KUR]šú-ra-u-e[31] LUGÁL [KUR]Bi-a-i-na-
u-e[32] LUGAL LUGAL [meš]-ú-e a-lu-se-e[33] [URU] Ṭu-uš-
pa-e[34] pa-ta-re [(m)]Ru-sa-a-še [m]Ar-giš-te-ḫi-né-še
a-le-a-lu-še[35] i-né DUB-te-e [t]ú-li-e[36] a-lu-še
pi-tu-li-e... a-lu- se u-li-še[37] ti-ú-li-e i-e-še z/sa-
du-ú-bé a-lu-še-ti- ne-ne[38] tú-li-e ma-se-e[39] [t]i-
né te-li-i[40] e-a-i [KUR]Bi-a-i-né-še[41] e-a-i lu-lu-i-ne-
še [d]Ḫal-di-še [d]IMse [d]UTU-né-še DINGIR[meš]-še
[m]i-i ti-i-ni mi-i ar-mu-ze-i mi-i zi-il-bé-i[42]
ki-ú-ra-i-di[43] [k]u- li-e-tú-ú-n[é][44] .

. ( دياكونوف ـ ١٩٦٧ )

# واتـای تێـکستـەکە بـە زمـانــی کـوردی

(خوداوەندی) خاڵدی١ پاشایەتی خۆی٢ (دەسەڵاتداری خۆی) بە رووسا٣ (کوڕی) ئەرگشتی٤ (دا)، نووسی: خـاڵدی٥ (لە) چاکەی٦ رووسـا (کـوڕی) ئەرگشـتی ئەئاوا (دەدوێت): لە دۆڵی کـوبلی٧ زەوی بێ بەر بوو٨، هیچی٩ تێدا نەبوو١٠ من (یش) ١١ خاڵدی١٢ فەرمانی دا (؟) ١٣ من ئەم رەزەم رێک خـست١٤ گـوندەکـان١٥ سەرلەنوێ١٦ لەوێـدا ئاوەدان بـووەنەوە١٧ کەنال لە١٨ (رووباری) ئولدارونا (م) راکێشا١٨ بۆ٢١ ئەوەی٢٢ هەرکە٢٩ رژایە (هاتە) ٢٤ نێـو کـەنال، رووسـا٢٣ مـەر بۆ (خـوداوەندی) خـاڵدی بکاتە قوربانی٢٥.. هەرکە لە ئاسمانەوە٢٦ ئاو دەچۆرێتە خوارێ دەبا بزن بۆ (خـوداوەندی) خـاڵدی (بکەنە) قـوربانی .. رووسـا (کـوڕی) ئەرگشتی٢٨ پاشـای بە توانا٢٩ پاشای مـەزن٣٩ پاشـای هۆزانی (سـەربەخۆ) پاشای بیـاین٣١ پاشـای پاشـایان، دەسـەڵاتدار٣٣ شاری توشپی٣٤ رووسا (کوڕی) ئەرگشتی ئەئاوا (دەدوێت): ئەو کەسەی٣٥ ئەو (نووسراوە) بسرێتەوە، ئەو کەسەی دروستی کرد٣٧ وای پێ دەڵێت: << من (ئەوەم) دروستکرد >> ئە ئەو کەسەی (ئەو) ناوە لە نێوبەرێت٣٨ و نێوی خۆی٣٩ لە شوێنی دابنێت٤٠، بیاینا٤١ و بێگانە٤٢ - خاڵدی تەیشیپا شیڤین و خوداوەندانی (دی) نە نێـو و نە نەوەی٤٣ (؟) نـە تـۆی ئـەو (ان) بـا بـۆ زەوی (لێیان) بە جێ نەهێڵێت٤٤.

تــێـبــیــنی:

---

١- (d) نیشانەی خوداوەندە، Ḫaldi-jə لە دۆخی مەبەست دایە.

٢- بە ewri-ji دەخـوێندرێتـەوەو واتای پاشـا، دەسـەڵاتدار دەگەیەنێت و لە دۆخی مەبەستە.

٣- m نیشانەی نێوی تایبەتییەو لە دۆخی بزرە.

٤- ئاوەڵناوی هەیی لە دۆخی بزری دایەو بە یارمەتی ئامرازی he- دارێژراوەو لە باری دیارخەری دایە.

٥- Ḫald(i)-inə ئاوەڵناوی هەییەو لە دۆخی دانان دایە.

٦- نێوی ئۆبستراکتەو لە دۆخی دانان دایە.

٧- ku-ub-ne واتای خۆیی دەبەخشێت و بە یارمەتی ina و ḫu-be-i لە دۆخی خستنەسەرەو kur نیشانەی کێوە.

٨- - man-o مان، شێوەی کۆنی مان بووە، (o-) نیشانەی کۆنی تێنەپەڕ بووە بۆ کاری man.

٩- شێوەی ناکراوی جێ ناوی نادیاری je(i) بووە، کە واتای هەرکەسێک، هەرشتێک، هەرچییەکی گەیاندووە.

١٠- ناوی بکەرو ناوی کراوی ئەنجامدارە.

١١- جێ ناوەو لە دۆخی تیان دایە.

١٢- لە دۆخی بزر دایە.

١٣- کاری گێڕاوەیی کەسی سێیەمە، u- نیشانەی کاری تێپەڕە، d کارە - فەرمانی دا.

١٤- کاری تێپەڕە بۆ کەسی یەکەمی تاک.

١٥- لەباری کۆ دایەو لەڕووی گرافیکەوە دەرنەبڕاوە، بەڵام بە patare-lə دەخوێندرێتەوەو شێوەی تاکی ئەم وشەیە patarə یە.
١٦- ئاوەڵناوەو لە ڕۆڵی ئاوەڵگوزارە دایە.
١٧- کاری تێپەڕە.
١٨- لە دۆخی مەبەست دایە.
١٩- کاری تێپەڕەو لەگەڵ -ag ی خووریدا بەراووردی بکە.
٢٠- ئامرازی گەیەنەرە.
٢١- لە دۆخی مەبەست دایەو لەڕووی گرافیکەوە واتای (هاتووە)ی بەخشیوە.
٢٢- ئەم وشەیە لە بنچینەدا بەم جۆرە بووە: -in(a) uka(i) he-nə، کە واتای [ئە ئەوەی (من)]ی گەیاندووە.
٢٣- ئاوەڵناوی هەییە.
٢٤- کاری تێنەپەڕی ناتەواوەو لە دەمکاتی داخوازی دایە.
٢٥- کاری تێپەڕە.
٢٦- لە دۆخی شوێن دایە بە یارمەتی (a-).
٢٧- کاری تێنەپەڕی تەواوەو لە دەمکاتی داخوازی دایە.
٢٨- Rusa-nə لە دۆخی ئەبسۆلوت دایەو نیشانەی ناسیاری لەگەڵدا هاتووە.
٢٩- LUGAL وشەیەکی سومەرییەو بە واتای پاشا، DAN,NU وشەیەکی ئەکەدییەو بە erel tara(i)e خوێندراوەتەوە.
٣٠- ئاوەڵناوەو بە inə- کۆتایی هاتووە.

٣١- šur ، له‌ باری تاك دایه‌و واتای شیر، چه‌كی گه‌یاندووه‌ šurǝlǝ له‌ باری كۆ دایه‌و واتای كه‌رته‌ی نیمچه‌ سوپایی(گونده‌كانی)ی به‌خشیوه‌.

٣٢- ده‌وڵه‌تی ئورارتوو به‌ خۆی گوتووه‌ Biainil، كه‌ كۆی ئاوه‌ڵناوی ئه‌تنیكی وشه‌ی bia-in بووه‌.

٣٣- ئاوه‌ڵناوه‌و وه‌كو ناو به‌كار هاتووه‌و كۆتایی به‌ usa- هاتووه‌.

٣٤- وشه‌ی Tušpa-e لێره‌دا بۆ patarǝ- شار ده‌گه‌ڕێته‌وه‌و هه‌روه‌كو ده‌بینین گیتیرۆگرامی URUی (شار)ی له‌سه‌ر داندراوه‌و واتای شاری توشپای گه‌یاندووه‌.

٣٥- له‌ باری بزردایه‌و جێ ناوی ale-lalu ی له‌گه‌ڵدا هاتووه‌.

٣٦- tur-u-l-e(i)ǝ < tulejǝ ده‌مكاتی داخوازی و مه‌رجه‌، له‌گه‌ڵ نووسینی پاشا - مینه‌وا(س) به‌راوردی بكه‌:

a - lu - še pa - ha - n [e - le] iš - ti ne- ne-

كه‌ له‌ دۆخی دانان دایه‌، كێ (مانگایان)(له‌ باری كۆ دایه‌) لێره‌وه‌ له‌گه‌ڵ خۆی ده‌بات (ده‌یفرێنێت)، ši-u-l-eja-la به‌ركاره‌و كه‌سی سێیه‌می كۆیه‌، به‌ڵام a-lu-še ni-ri-bē- iš- ti-nē-nē-ḫa-a-n-lie-e [كێ لێره‌دا (مێگه‌ڵه‌) مه‌ڕ ده‌بات بڕوانه‌ (Melkishvili 1962)

٣٧- له‌ دۆخی بزر دایه‌.

٣٨- له‌ باری ناسیاری دایه‌ (n-) له‌ ئاوه‌ڵناوی tina < tiwe(i)na ـه‌وه‌ هاتووه‌، كه‌ ڕۆڵی ناوی گێڕاوه‌، خووری -

tiwe وشه، قسه، بەڵێن.

٣٩- جێ ناوی ئاوەڵناوییەو لە ma - (u)se وە دارێژراوە.

٤٠- لە ter - u -e(j)ə وە هاتووە.

٤١- ئاوەڵناوەو لە دۆخی بزر دایەو بە inə کۆتایی هاتووەو لەگەڵ خاڵی ژمارە (٣)دا بەراوردی بکە.

٤٢- جێ ناوی هەیی کەسی سێیەمی تاکە.

٤٣- دۆخی ڕێچکەیە qəwra - edə.

٤٤- دارشتنەکەی ئەوەند روون و دیار نییەو لەوانەیە ku (l- u) -l-ejə-ito-ne بێت، کە شێوەی کۆی u-l-ejə-ـەو نیشانەی بەرکاریشی هاتۆتە سەر، کە کەسی سێیەمی تاکە.

# چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

بزوێنی تیماتیکی- ئەو بزوێنەیە، کە دەکەوێتە کۆتایی مۆرفیمێکەوە بۆ ئەوەی بتوانێت پاشگرێک، یا مۆرفیمێکی دی بەو مۆرفیمەوە بلکێت هەروەکو (o)لە وشەی speedometer لە زمانی ئینگلیزی و (e) لە وشەی groteappel لە زمانی هۆڵەندی و (ە) لە وشەی گوڵەگەنم لە زمانی کوردی دا.

گراف- نیشانەی نووسینە بۆ دەنگێک، بەڵام هێندێک جار لە هێندێک زماندا دەبێتە نیشانە بۆ زێتر لە دەنگێک، هەروەک لە زمانی ئینگلیزیدا s نیشانەی کۆیەو دەنگی [s] دەردەبڕێت وەک وشەی books، بەڵام لە وشەی doors دەنگی [z̄]ی دەربڕیوەو لە وشەی occasion دەنگی [z̄].ئەم بارەی بەکارهێنانی گرافێک بۆ دەنگێک زێتر لە نووسینانی خووری و ئورارتووشدا هەبووە .

نیشانەی گرافیکی- نیشانەی نووسینە بۆ تیپی ئاسایی، کە لە نێوان دوو کەوانەی < > دەنووسرێت بۆ ئەوەیە لە نیشانەی دەنگێکدا جودابکرێتەوەو کە لە نێوان دوو کەوانەی [ ]دا پێشان دەدرێت، هەروا نیشانەی فونیمی لە نێوان دوو کەوانەی / /و نیشانەی مورفیمیش لە شێوەی { } دەردەبڕێت.

S, Z ی خووری و Sی ئورارتوو بەرامبەر (ژ)ی کوردی یە.

.h // kh , dz // ج ،tš//C̄

ə// ە δ// ذ، غ// ɣ، ت// θ



کێلی شپوینی و مینەوا(س)، کە بە زمانی ئورارتوو نووسراوەو لە ناو جەرگەی کوردستاندا دۆزراوەتەوەو لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ دا لەبەر دەرگەی موزەخانەی وورمێم دیوە.

ژێـــــدەر:

---

Gadd J. C., Tablets From KirKuK . RA , Tom XXII , 1920 , p. 49.
Speiser E. A. , Mesopotamian Origin . philadelphia ,1930.
Speiser E. A. , Introduction to Hurrian . AASOR 20 , NewHaven 1941
Speiser E. A. , The Hurrian Participation in the civlizations of Mesopotamia , Syria and Palestine . CHM 1 (1953 - 1954) PP. 311 - 327.
Gelb I. J. , Purves P. M. , MacRae A. A. , Nuzi Personal Names . Chicago 1943.
Melikishvili G. A. , Urartski Klinoobrazniy Nadpisi . VDI , No 1 , 1953 .
Melikishvili G. A. , Nairi - Urartu . Tbilisi 1954
Melikishvili G. A. , Urartski Klinoobrazniy nadpisi . M -L , 1960 .
Melikishvili G. A. , Urartski Yazik . M. 1964 .
Benedict V. , Urartian Phonology and Morphology. Ann Arbor , Michigan 1962.
Mishaninov I. I. , Gramatijeski story Urartskovo

Yazika . M. 1962.
Jorgen Laesson, People Of Ancient Assyria. London 1963.
Diakonoff I. M. , Yaziki Drewney predni Azii . Moskwa 1967.
Diakonoff I. M. & Starostin S. A. , Hurro - Urartian as an Easteren Caucasian Language . Munchen 1986.
Van Loon M. ,The Euphrates mentioned by Sarduri II of Urartu . Fs. H. G Guterbock , Istanbul 1974.
BArnett R. D. , The Hiroglyphic Writing of Urartu ,Fs . H. G Güterbock, Istanbul 1974.
Sasson J. M Hurrians and Hurrian Names in the Mari Texts . UF 6 , 1975, 353 - 400.
Wilhelm G. , Zum Urartaischen Nomialflexion. ZA 66 , 1976, 105 - 119.
Nozagzi N. A. , Voprpsi strukturi Khritskovo glagola . Tbilisi 1978.
Salvini M. , Problemi di morfolodia nominale in Urarteo . Aion 1979, 97 - 115.

ک.ک. کوردۆیێڤ. ڕێزمانی کوردی. (وەرگێڕی لە زمانی ڕووسی‌یەوە - د. کوردستان موکریانی بەغدا ١٩٨٤).
Khajikyan M. L., Khuritski i Urartski Yaziki. Moskwa 1985.
د. جمال رشید أحمد. دراسات کردیه فی بلاد سوبارتو. بغداد، ١٩٨٦.
د. جمال رشید أحمد. لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری. بەغدا، ١٩٨٨.
د. جمال رشید أحمد، د. فوزی رشید، تأریخ الکرد القدیم، أربیل، ١٩٩٠.
Groz K ., The Archive Wullu Family. Copenhagen 1988.
Filhelim G ., Drewnie Narod Huriti. Moskwa 1992.

## پەرتووکی چاپکراوی نووسەر:

١- فەرهەنگی رووسی - کوردی بە هاوکاری ی. کیدایتینە، مۆسکۆ، ١٩٧٧.

٢- هۆنراوەی ئافرەتی کورد، هەولێر، ١٩٨٠.

٣- رێزمانی کوردی بە هاوکاری د. نەسرین فخری، هەولێر، ١٩٨٢.

٤- رێزمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی) لە زمانی رووسیێوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٨٤.

٥- بیست چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی، هەولێر، ١٩٨٤.

٦- کەشکۆلی گیو، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٦.

٧- سینتاکسی رستەی سادە لە زمانی کوردی دا، بەغدا، ١٩٨٦.

٨- زارە کوردییەکان بە هاوکاری دوکتۆر کامل بصیر، صادق بهاء الدین و حەمەمین هەورامانی، هەولێر، ١٩٨٧.

٩- کەشکۆلی گیو، بەرگی دووەم، هەولێر، ١٩٨٨.

١٠- قواعد اللغه الکردیه، بغداد، ١٩٨٩.

١١- رەنگدانەوەی دۆزی ژن بە-نێوی ژنەوە لە نێو رۆژنامەگەری کوردیدا (١٨٩٨ - ١٩٧٠). هەیرن فەین، ١٩٩٥.

١٢- تیشکێک لەسەر زمانی دانیشتوانی کۆنی کوردستان (زمانانی خووری و ئورارتوو)، هەیرن فەین، ١٩٩٥.

## نامیلکەی چاپکراو:

ژنی کورد و دۆزی نەتەوایەتی، هەیرن فەین، ١٩٩٥.

## لێکۆڵینەوەی بڵاوکراوەی نووسەر:


١- ئامرازەکانی خستنە سەر لە زمانی کوردیدا، کۆڤاری زانکۆ، بەرگی ٤، ژمارە ١، ١٩٧٨، لاپەڕە ١٤٥ - ١٧٥.
٢- ئافرەت لە هۆنراوەی کوردیدا، سلەیمانی، ١٩٧٨.
٣- المرأة في الشعر الکردی، سلیمانیە، ١٩٧٨.
٤- جۆرەکانی جێ ناوو دەوریان لە ڕستەی کوردیدا، کۆڤاری کۆڕی زانیاری عراق - دەستەی کوردی، ژمارە ٧، ساڵی ١٩٨٠، ٢٢٩ - ٢٥٤.
٥- جۆرەکانی ڕستە لە زمای کوردیدا، کۆڤاری زانکۆ، ژمارە ١، بەرگی ٦، ١٩٨٠.
٦- دەنگی ئافرەتی کورد لە نێو هۆنراوەکانیدا، کۆڤاری بەیان، ژمارە ٦٣، ١٩٨٠، ٧ - ١٦.
٧- ناو لە ڕستەی کوردیدا، کۆڤاری زانکۆ، ژمارە ١، بەرگی ٧، ١٩٨١، ٦٧ - ٩٤.
٨- ئاوەڵناو لە رستەی کوردیدا، کۆڤاری کاروان، ژمارە ٥، ١٩٨٣.
٩- حەبیبەی نالی کێ بوو؟ کۆڤاری بەیان، ژمارە ٨٦و٨٧، ١٩٨٣، لاپەڕە ٢٨-٣٣، ١٨-٢٤.
١٠- چۆنیەتی نووسینی چاوگەی نەسادە، کۆڤاری کۆڕی زانیاری عراق-دەستەی کوردی، بەرگی ٩، ١٩٨٣، ١٨٦-٢١١.
١١- چۆنیەتی پەرەسەندنی ئۆرتۆگرافی لە رۆژنامەگەری کوردیدا، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٢، ١٩٨٤، ٣٨-٤٥.
١٢- لەگەڵ نۆبەرەی رۆژنامەگەری کوردیدا، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٦، ١٩٨٥، ٣٢٣-٣٣٣.

١٣- تیشکێک لەسەر کۆڤاری رووناکی، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٧، ١٩٨٥، ٢٦٤-٢٧٧.
١٤- رستەی شوێن کەوتووی کات، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١١، ١٩٨٦، ١٤٨-١٦٠.
١٥- رستەی شوێن کەوتووی هۆیی، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٤، ١٩٨٩، ١٥١-١٥٧.
١٦- رستەی شوێن کەوتووی مەرج، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٥، ١٩٩٠، ٧٢-٧٨.
١٧- رستەی شوێن کەوتووی پێوانە، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٦، ١٩٩٠.
١٨- رستەی شوێن کەوتووی پێچەوانە، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٨، ١٩٩٢، ٤٦-٥٣.
١٩- چەند سەرنجێک لە سەر زمانانی خووری و ئورارتی، کۆڤاری زانکۆ، هۆڵەندە، ژمارە ١، ١٩٩٤.
٢٠- Een Blik Op De Choerie en Oerartoe Talen,ZANKO 1, November 1994.

ئەو بابەتانەی دەستنووسن و ئامادەی چاپن:-

---

١- شێوەزاری سلێمانی لە زمانی رووسیەوە وەرم گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لەبەرهەمە بەنرخەکانی پرۆفیسۆر زەرێ یوسوپۆڤایە.
٢- کەشکۆلی گیو، بەرگی سێیەم.
٣- کۆڤاری رووناکی ١٩٣٥-١٩٣٦.
٤- الخبر فی الجملە الکردیە.

٥- المبتدأ في الجمله الكرديه.

٦- كێشەی نووسینی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی و چارەسەرکردنی، لە ٢٩/١٠/١٩٩٣دا لە کۆنفرانسی زمانی کوردی لە پاریس دا پێشکێشم کرد.

٧- بەرەو زمانێکی یەکگرتووی کوردی لە ١٩٩٤/٦/٢دا لە کۆنفرانسی چاندو هونەری کوردی لە ماستریخت پێشکێشم کرد.

٨- بەراورد کرنا هندەک تایبەتیا دیالێکتۆلۆژی لناقبەرا دیالێکتا کرمانجی ژووری و دیالێکتا کرمانجی ناڤی، لە کۆنفرانسی زمانی کوردی لە ١٠/١/١٩٩٥دا لە بەرلین پێشکێشم کرد.

٩- سەردەمەکانی زمانی کوردی و کۆمەڵە زمانانی ئێرانی.

١٠- هوردە خەم و باری لێکچووی ژنە کورد و ژنە ئەورووپی، لەو سەمینارییەدا پێشکێشم کرد. کە مەڵبەندی رۆشنبیری کوردی لە ٢/١٠/١٩٩٤دا لە رۆتردام رۆژێکی تایبەتی بۆ ژنان ساز کردبوو.

١١- ژنی کورد بە ستەم دەورە دراوە.

١٢- چەمکی ژن لە نێو پەندی پێشینانی کورد، رووس، هۆڵەندی و ئینگلیزدا.

١٣- ژنی کوردو شوێن کەوتەیی، لەو سەمینارییەدا پێشکێشم کرد، کە یەکێتی ژنانی کوردی هۆڵەندە لە ١٩٩٥/٦/٢٣دا لە ئەسن بورگ دا رێکیان خستبوو.

١٤- هۆی کەم بەرهەمی بیری ژنی کورد، لەو سەمینارییەدا پێشکێشم کرد، کە لە ١٩/٥/١٩٩٥دا لە ئەلمێرەدا مەڵبەندی فەرهەنگی کوردی شاری ئەلمێرە سازی کردبوو.

١٥- تێڕوانینی ژن بۆ سەربەستی.

١٦- ئەناهیتا هەر دەمێنێت.

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی نیشتمانی (٣٨)ی ساڵی ١٩٩٩ دراوەتێ